# تەڵاق



# لە قورئانی پیرۆزدا



چاپی یەکەم

دانانی
دکتۆر مستەفا ئیبراهیم زەڵمی
پسپۆڕ لە شەریعەت و قانون

عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد، ئەحمەدئاوایی
کردوویەتی بە کوردی

# تەڵاق
# لە قورئانی پیرۆزدا

چاپی یەکەم

دانانی
**دکتۆر مستەفا ئیبراهیم زەڵمی**
پسپۆڕ لە شەریعەت و قانون

عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد، ئەحمەدئاوایی
کردوویەتی بە کوردی

# تەلاق لە قورئانی پیرۆزدا

دانانی : دکتۆر مستەفا ئیبراهیم زەڵمی
وەرگێڕانی: عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد، ئەحمەدئاوایی
چاپی یەکەم ٢٠١٥
تیراژ : (١٠٠٠)دانە
نەخشەسازی: جمعە صدیق کاکە
بەرگ: خەلیل هیدایەت مام شێخ
سەرپەرشتی: ڕێدار ڕەئوف احمد
شوێنی چاپ: چاپخانەی ڕۆژهەلات/ هەولێر
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٢٢٤) ساڵی ٢٠١٥ پێدراوە

http://zalmi.org/arabic
dr.alzalmi@gmail.com
facebook.com/dr.alzalmi

﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ ﴾ سورة البقرة: ٢٢٩

**واته: تەلاقێك كە بردنەوەی لە دواوە بێ، دوو جارە، و ئینجا دوای ئەوە ڕاگرتنە بە خۆشیی، و یان بەرەڵڵاكردنە بە باشیی.**

**پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلّم"، دەفەرموێت:**

**(أَبْغَضُ الحَلالِ إلى اللهِ تَعالى الطَّلاقُ)**

**(رواه أبوداود: ١٨٦٣)**

**واتە: دزێوترین حەڵاڵ لە لای خوای گەورە و سەروەر، (تەلاق)ە!**

# ناوەرۆك

## پێشەکی[1]:

خوێنەری بەڕێز، مەبەست لەم باسە، بێدارکردنەوەی موفتیو دادوەر، و توێژەر، وخوێنەرە، لەم خاڵانەی خوارەوە :

١. ئافرەت کاڵایەك نییە، کڕینو فرۆشتنی پێوە بکرێت، و نرخەکەیشی ئەو مارەییە بێت، کە هەیەتی، بەڵکو ئافرەت زۆر لەوە بەنرخترە، کە (بە نرخی شتومەكو کاڵا)، نرخدار بکرێت!

٢. ژن لە ژێر ڕەحمەتی پیاودا نییە، بەو واتایەی ئەگەر بیەوێت، لای خۆی بیهێڵێتەوە، و ئەگەر بیەوێت، بەرەڵڵای بکات، بەڵکو تەڵاق بوغزێنراوترین کردەوەی ڕێپێدراو (حەڵاڵ)ـە، و بۆیەش شەرع بڕیاری لەسەر داوە، تا لە کاتی ئێجگار پێویستدا بەکار بخرێت، و ئەندازەگیری، و حساب بۆ ئەو پێویستی، و زەرورەتە بکرێت.

٣. هاوسەریەتیش گرێبەستێکی گران بەهـــا، و بەشدارەکییەکی ڕۆحی یە، کە سەرمایەکەی ئەو خۆشەویستیو ڕێزە دوو سەرەیەیە، لە نێوان هەردوولادا، و سوودەکەیشی وەبەرهێنانی وەچەیەکی چاکەکاری نوێیە .

٤. تەڵاق لە قورئاندا بۆ چەند هەنگاو، و قۆناغێك سنووردار کراوە، نەك بۆ چەند ژمارەیەك، بۆیە تەڵاقی ژمارەدار، تەنها یەك تەڵاقی پێ دەکەوێت !

٥. ئیسلام دوورە پەرێزە لەوەی کە بە ساتەوەختێکی کەم، ئەو پێکهاتە خێزانیەی نێوان دوو هاوسەر، و منداڵەکانیان، کە بە چەندەها ساڵ، و بە تێچوونێکی دژوار پێکهێنراوە، هەڵبوەشێنرێتەوە .

---

[1] ئەم پەڕاوە گچکەیە، لەو پەڕتووکە بەرفراوانەی خۆمانەوە، وەرمان گرتووە، کە ناومان نابوویە: (مدى سلطان الارادة في الطلاق في الشرائع والقوانين والأعراف خلال أربعة آلاف سنة).

٦. تەلاق لە قورئانی پیرۆزدا، بە هەشت قۆناغدا تێپەڕ دەکات، و پەیوەندی ژنو مێردایەتی، لە هەشتەمیاندا کۆتایی دێت.

## مافی تەلاق لە دەستی کێدایە ؟

هەندێ کەس وا گومان دەبەن، کە تاکڕەوی پیاو لە بەدەست بوونی مافی تەلاقدا، ئەمەی خولقاندووە، کە پیاو زیاتر تیایدا بڕیار بە دەست بێت، هەرچەندە ئافرەتیش خاوەن ڕایە تیایدا، خۆ ئەگەر ئافرەت مافی ڕادەربڕینی تیادا هەبووایە، یاخود لە ژێر چاودێری دادگادا بووایە، ئەوکات بواری زیادەڕەوی کردن، یان بێ ویژدانیکردن لە بەکارهێنانیدا کەمتر دەبوو، ئالێرەوە مرۆڤ، ئەو پرسیارەی بۆ دێتە ئاراوە، کە کار وا بێت، ئیتر بۆچی پیاو ئەو مافەی لە ئیسلامدا دراوەتە دەست، سەرەڕای ئەوەی کە ئیسلام پەرۆشی ئەوەیە کە خوانەخواستە بڕیارێك دەربکات، زیانو ڕۆتیناتی لێ بکەوێتەوە ؟!! لە کاتێکدا کە هەر خودی ئیسلام سەرکۆنەی هەموو بڕیارێك دەکات، کە زیادەڕەوی تیادا بێت، و ڕوونکردنەوەی ئەم ڕاستییەش پێویستی بە توێژینەوەی ڕەهەندە جیاوازەکانی ئەم بابەتە هەیە، و لێرەشدا پێنج ڕێتێچوونی عەقلی هەیە :

١. یان ئەوەیە، کە تەلاق تەنها بە دەستی ئافرەتە .

٢. یاخود تەنها بە دەست پیاوەوەیە .

٣. یان بە ڕێکەوتنی هەردوولا تەواو دەبێت .

٤. یاخود لە ڕێی دادگاوە دەبێت .

٥. یان بە دەست پیاوە، و هەلێك دەداتە ئافرەتەکە، بۆ دارای تەلاق.

### ١. تەلاق تەنها بە دەست ئافرەتە:

لەبەر چەند هۆیەك ئەم پەی پێبردنە ناگونجێت :

أ. چونکە تەلاقو هاوسەریەتیش دوو سیستەمن، کە لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا لە سەر بنەمای زگماك بونیات نراون، کە ئەوەیە (نێر)،

داوای (مێ) دەکات، و ئافرەت داواکار نییە ! و پیاوەکە دەچێتە خوازبێنی ژن، و ژن خوازبێنیکار نییە، و لە زگماکیشدا، بوونی مافێکی لەم جۆرە، و لە پرۆسەیەکی لەم جۆرەدا، بۆ کەسە خوازبێنیکارەکەیە، ( کە دەسپێشخەری کردووە، و یەکەم کەس بووە، لە پرۆسەکە هاتووەتە پێش)، و ئیسلامیش، لە سەر ئەم خووە زگماکیە رۆیشتووە، و ئەو مافەی بە تەنها بە ئافرەت نەداوە .

ب. تەلاّق هەڵسوکەوتێکە، کە چەند حاڵەتێکی دارایی، وەك پاشکۆ پێوەیە، بۆ نموونە، پیاو لە سەریەتی کە مارەیی تەواو بداتە ژنەکە، و ئەرکی ماڵی لە کاتی (عِـدّة: ماوەی دیاریکراوی دوای تەلاّق)دا، و پێویستی منداڵەکان، و کرێی دایکایەتی، بدات، و هەروەها ئەگەر ویستی ژنهێنانی نوێ ئەنجام بدات، ئەرکی ئەویشی لە سەرە.

جا دادپەروەری، و ویژدانداری نییە، کە کەسێك بخرێتە ژێر بڕیارێکەوە کە کاری خەڵکی تر بێت، و مافی خەڵکی تری تیا پارێزراو بێت، و دواتریش ئەم پاشبەندە ماڵییە، وا لە پیاو دەکات، کە بیر لە کاروبار بکاتەوە، و خۆڕاگر بێت، و پێش کردنی هەر کارێك، باش لێی وورد ببێتەوە، و وایشی لێ دەکات، کە سوور بێت، لە سەر گرێبەندی هاوسەرێتی، و تا پێویستییەکی گرنگ، و پێداگر نەبێت، بۆ هەڵوەشاندنەوەی، هەر بەردەوامی پێ بدات .

ت. ئافرەت بە حوکمی ئەو پێکهاتە سروشتیەی کە هەیەتی، زیاتر لە پیاو پەشیمانیو کاردانەوەو دوورکەوتنەوە، کاری تێ دەکات، و ڕووی تێدەکات، لەو بارودۆخە جۆربەجۆرانەدا کە لە ژیانیدا ڕووبەڕووی دەبنەوە، ئەگەر مافی تەلاّق تەنها بە دەست ئەو بێت، ئەوا خراپ بە کاری دەهێنێت، چونکە بێگومان زۆرجار ئافرەت لە کاتی تووڕەییو دژوارییەکاندا، گوێ بە دەرئەنجامی کارەکان نادات، کە چۆن دەبن! و هەندێك لەو ئەزموونانەیش کە گەلە پێشووەکان پیایدا تێپەڕ بوون، سەلماندویانە، کە تەلاّقدانە دەستی ئافرەت هۆکارێکی کاریگەرە، بۆ زۆربونی ڕوداوەکانی تەلاّق، هەروەك ئەمە

لە لای ڕۆمانەکاندا، و لـە سـەردەمی کلاسـیکدا، و هـەروەها لای هەنـدێ تیـرەی عەرەب، لە سەردەمی نەفامیدا ڕوویداوە.

## ٢. تەلاَق تەنها بە دەست پیاو بێت:

هەندێکجار نیشانە گەلی جۆراوجۆر (ناچاری)، بێت، یان (ئیختیـاری)، لـە سەر ژیانی هاوسەرایەتی، دەردەکەون، کـە ئەگـەر بـەردەوام بـن، زیـان بـە بەرژەوەندی ئافرەتەکە دەگەیـەنن، وەك حاڵـەتی دیارنـەبوونی مێردەکـەی، و یاخود حوکمدانی بە سزایەك کە ئازادی لـێ زەوت بکـات، یـان وەك تـووش بوونی بە نەخۆشییەك، کە چارەسەر بوونی مـەحاڵ بێت، و یان وەك ئەوەی کە نەتوانێت بژێوییان دابین بکات، و یان هـەر نـەیکات! یـان وەك ئـەوەی کـە مامەڵەی خراپ بێت، لەگەڵ ئافرەتەکەدا ... کە ئەگەر لێرەدا مـافی تـەلاَق تەنها لای پیاو بێت، و ئافرەتیش لێی بێ بەش بێت، ئەوا ئافرەتەکە دەبێتـە قوربانی ئەو ڕووداوانە .

بۆیە لەم حاڵەتانەدا ئیسلام، مافی بە ئافرەت داوە، کە دەتوانێت داوای تەلاَق لـە دادگـادا بکـات، تـا بەرژەوەنـدی خـۆی بـەو تەلاَقانـە، و بەرژەوەنـدی مێردەکەیشی بە هاتنە دادگا بپارێزێت.

## ٣. تەلاَق بە دەست (ژن و پیاو) بێت، پێکەوە :

ئیسلام وای داناوە کە (تەلاَق)، بە ڕێککەوتنی هەردووکیان بێت (ژن و پیاو)، هەروەك لە (خولع: کڕینەوەی تەلاَق لە مێـرد)دا، هەیـە، ئەمـەش کاتێـك دەبێت، کە کارەکەیان سەرپێیی و بێ لێکدانەوە نەبێت، تا هەر دوولا لە سەر تەلاَقەکە لە سەرجەم ڕەهەندەکانییەوە ڕێك بکەون، و ئەوە نەیەتە ئاراوە کـە لایەنێکیان نـەیار بێـت لـە کارەکـەدا، بـە مەبەسـتی زیـان گەیانـدن بـە لایەنەکەی تر !

## ٤. تەلاَقدان، و بەڕەڵلاَکردنی لە دادگادا :

ئـەم شـێوازە لـە شـەریعەتی (موسـایی – جوولەکـە)، و (مەسـیحی –

گاور)ـەکاندا، و لە زۆر لە یاسا دەسکردەکاندا بـەکاردێت، کـە بـەم پێیـە تەلاّق بە هیچ جۆرێك دروست نابێت، تا لەبەردەم دادگادا، و بە سەرپەرشتی دادگا نەبێت !

بەلاّم ئیسلام دانی بەمەدا نەناوە، لەبەر چـەند کاردانەوەیـەکی خراپـی ئـەم شێوازە، لەوانە، ئاشکراکردنی نهێنیەکانی ژن و مێردایەتی لە بەردەم دادگا، و پارێزەرەکانی هەردوولادا، کە هەندێکجار ئەو نهێنیانە زۆر خراپ لە سـەر کەسایەتی خێزانەکان دەکەون، و ئایندەی ژنەکە تێك دەشـکێنن، وا دابنـێین کە پیاوێك بەدگومانیو دڵەڕاوکێی لە هەڵس وکەوتی ژنەکەیدا بۆ دروسـت بووە، و دەبینین لە بەردەم دادگادا، و بە سەرپەرشتی دادگا تـەلاّقی دەدات ! سەیرکە دەرئەنجامـە ئابڕوبـەرەکانی ئـەم کـارە چـەندە زۆرن؟! و چـەندەیش کاریگەری هەیە، لە سەر پڕوپاگەندە بۆ کەسایەتی دوو هاوسەرەکە، و کەس و کاریان؟! سەرەڕای ئەوەش کە هۆکارەکانی تەلاّق زۆرجـار کۆمەڵـە شـتێکی ناوەکین، وەك، حەز پێنەکردن، کە ئەمە بە بەڵگـەو ئەوانـە دەرنابڕدرێـت، و تەنها خاوەنەکەی پێـی دەزانێـت، و بـەم جـۆرەش دەچـێتە دەرەوەی سـنوری دەسەڵاتی دادگا .

## ٥. تـەلاّق بـە دەسـت پیـاو بێـت، بـەلاّم هـەل بداتـە ئافرەتیش، تا لە کاتی پێویستدا داوای بکات :

ئیسلام ئەم ڕێگا تەندروستەی دان پیاناوە، و تەلاّقی وەك مـافێکی سروشـتی پیاو داناوە، چونکە لە گەڵ ئەرکـەکانی پیـاودا، بەرامبـەر بـە ژن و مـاڵ و منداڵی دەگونجێت، لە بەر ئەوەی کە دەبێت پیاو مارەیی بداتو بژێوی دابین بکات، بۆیە دەبێت مافی کۆتایی هێنان بە پەیوەندی ژن و مێردایەتیش، هەر

لە لای ئەو بێت، ئەمەش وەك پڕاكتیزەكردنێكی یاسای (الغُـنمُ بـالغُرم)[1]، و هەروەها لەبەر ئەوەیش كە پیاو زیاتر دەتوانێت، كۆنترۆڵی باری دەروونی خۆی بكات، و زیاتریش پێزانە لە كاتی تـوڕەیی‌و دژواریـدا بـە دەرئەنجامـەكانی تەلاَق، بۆیە ئەم مافە لە دوای تەواوی نائومێدیی لە سەركەوتن‌و بەختەوەری ژن‌و مێردایەتیدا نەبێت، بە كاری ناهێنێت، و ئیسلام مافی ژنیشی لەم كارە دژوارەدا، كە چارەنووسی ژن‌و مێرد دیاری دەكات، لە بیر نەكردووە، و بەڵكو مافی داواكردنی تەلاَقی لە دادگای تایبەتدا پێـداوە، و لـە كـاتی ڕوودانـی ڕووداوێكدا كە زیان بە بەرژەوەندییەكانی بگەیەنێت، لە سەرجەم ڕووەكـانی (ژیان‌و تەندروستی‌و سێكس)ـەوە، و درێژەی ئەم باسەش لە باسی (التفریـق القضائی: جیابوونەوە لە دادگادا)دا، دێت، و هەروەها ژن مـافی ئازاد بوون لە كۆتی تەلاَقی هەیە، بە ڕێگای (تفویض: سپاردنی كارەكە بە كەسێكی تر، و سەرپشك كردنی)، ئیتر ئایا ئەم مافە لە گرێبەستی هاوسـەرێتیدا درابێتـە كەسەكەی تر، وەك هەندێك لە (شەرعزانان: فُقَهـاءْ) دەیڵـێن، یـاخود دوای بونیات نانی ژن‌و مێردایەتی بێت، و ئیسلام كە مـافی تەلاَقی داوەتـە پیـاو، ئیتر بەرەڵای نەكردووە، كە ئەو مـافە بە هەواو هەوەسی خۆی بـەكاربهێنێت، بەڵكو سنوور گەلێكی بۆ داناوە، و كۆمـەڵێك ڕێ‌و شوێنی چارە ئـامێزی بـۆ داناوە، كە لە سەری پێویستە جێبـەجێیان بكـات، لەوانـەش ئـەو قۆنـاغ و هەنگاوانەی تەلاَقن، كە قورئانی پیرۆز ڕوونی كردوونەتەوە .

## هەنگاوەكانی تەلاَق :

وەك پەرۆش بوونێك بـۆ ئـەوەی كـە ژیـانی هاوسـەرێتی بـەردەوام بێـت، و

---

[1] . (الغُنم بالغُرم): یُقرأ بضم الغینین، ومعناه، أن من ینـال نفـع شیء، یتحمـل ضرره، واتە، هەركەس سود و بەرژەوەندی لە هەر شتێكدا هـەبوو، دەبێت باجی زیانی هەمان شتیش، لە ئەستۆ بگرێت.

پێکهاتەی خێزان کە لە وەچە گەلێکی گەورە، و بچووك پێك دێن، و لەو کێشمەکێشمەدا بێتاوانن، هەڵنەوەشێتەوە، و دامەزراوەی خێزان بە سەر گەورە و بچوکی ماڵدا، کە هیچ تاوانێکیان نییە، کاول نەبێت، و هەروەها وەك هاندانێك بۆ ئەوەی کە بە ئاسانی جڵەو شل نەکرێت، بۆ تۆران‌و ڕق لە یەك بوونەوە، و ناکۆکی، و جیاوازی، و دووبەرەکی، و پەلە کردن لە پساندنی ڕشتەی پەیوەندییەکانی هاوسەرێتی، شەریعەتی خوای پەروەردگار لە دوا دەستووریدا کە (قورئانی پیرۆز)ـە، چەند هەنگاوێکی، یاخود قۆناغێکی، سیستماتیکی، و لەسەرخۆی داناوە، تا پێ بە پێی ئەم قۆناغانە، کۆتایی بەو پەیوەندییەی ژن‌و مێردایەتییە بهێنرێت، و فەرمانیشی داوە، کە پلە بە پلە جێبەجێ بکرێن، سا بەڵکو ئەو تەم‌و مژەی هاتۆتە ڕێ لابچێت، و ئەو خۆشەویستییەی بەزایە چووە بگەڕێتەوە، و ئیتر ژیانی هاوسەرێتی ڕێی دروست وەربگرێتەوە، و جێگیر، و بەردەوام ببێتەوە.

ئەو هەنگاوانەیش کە قورئانی پیرۆز دیاری کردوون، هەشت هەنگاون:

## هەنگاوی یەکەم : (ئامۆژگاری کردن: "فعظوهن": ئامۆژگاری خێزانەکانتان بکەن):

قورئانی پیرۆز فەرمانی داوە، کە لە کاتی تۆرانی ژندا، پیاو لە جیاتی تەلاقدانی ژنەکەی ڕێگای ئامۆژگاری کردن بگرێتە بەر، و ڕێڕوونی‌و ئاراستەکردنی، و بێدار کردنەوەی لە هەڵەکانی پیشان بدات، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ)[1]، ئەم ڕێگایە ئەرکی

[1]. ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُ وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهْجُرُوهُنَّ فِي ٱلْمَضَاجِعِ وَٱضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا ﴿٣٤﴾﴾ (النساء:٣٤)، واتە: پیاوان

یەکەمی سەرشانی خاوەن ماڵە بۆ ریفۆرم کردن لە سەرجەم ئەو شتانەیدا کە تووشی گەندەڵی بوون، چونکە پرۆسەیەکی پاکسازییە، کە لە سەر تێکڕای ئەنـدامانی خێزانـە، لـە سـەری بـڕۆن، و هـەروەها خـوای پـەروەردگار دەفەرمویت:(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ

---

بەڕێوەبەرو سەرپەرشتی کەری ئافرەتانن، خودا فەزڵی پیاوانی بەهێزو تواناو گورج و گۆڵی داوە بەسەر ژناندا، ئەوەتە پیاوان ئەتوانن کـاری گـران بکـەن و غەزا بکەن و سنوور بپارێزن، بێجگە لەوەیش ژنان لـەکاتی حـەمل و شـیردانەدا ئیشیان پێ ناکرێ و، لەکاتی عوزری شەرعی (ماوەی حەیز)دا بـۆ هاتنـە نـاو کۆمـەڵ ناشـێن، هـەروەها بـەراورد کـراوە ژنـان دڵیـان لـە پیـاو ناسـکترەو سەبریان لەسەر زەحمەت کەمترە، هەروەها پیاوان ماڵی خۆیان خەرج ئەکەن بۆ ژنەکانیان چ بۆ مارەیی و چ بۆ نەفەقە، جا مـادام ژن لـە ئیـدارەی پیـاودا بێت و کاروباری ناومـاڵی بـۆ ڕابگـرێ پێویسـتە پیـاویش خـەرجی و نەفەقـەی ناوماڵ بگرێتە ئەستۆ، جا ئەو ژنانە کە صالحن وعیبادەتکارن و لەسەر مـاڵو ناموسی خۆیان و مێردەکانیـان ئـەمێنن و بـە یارمـەتی خـودا پارێزگـاری لـە وەزعی خۆیان و مێردەکانیان ئەکـەن، ئـەو ژنانـەش کـە ئـەیانبینن لـە ڕێگـا لائەدەن ئامۆژگارییان بکەن، ئەگەر تەمێ کردن و ئامۆژگاری سوودی نـەبوو، ئەوا لە جێگەی نووستندا لەگەڵیان مەبن، واتە لەگەڵیان مەخـەون، و ئەگـەر ئەوەیش سوودی نەبوو ئەوا لێیان بدەن بەڵام لێدانێکی بێ زیان، جـا ئەگـەر گوێڕایەڵ بوون و هاتنە سەر باری خۆشی و پێکەوەژیانی بە ئاسوودەیی، ئیتر ڕێیان لێ مەگرن و بەهانەیان پێ مەگرن و سەرزەنشتیان مەکەن و، وا فەرزکەن هـیچ لـە بـەینتانا ڕووی نـەداوە،خوا بـەرزەو پایـەی باڵایـەو لـە ئێـوە بـە دەسەڵاتترەو گەورەیە، کەواتە لێی بترسن و خۆتان لە گوناه بپارێزن.

)[1]، کە لێرەدا مەبەست لە ئامۆژگاری کار، کەسێکی دیاری کراوە، بۆ ئامانجێکی دیاری کراو، کە ئەویش چارەسەر کردنی سەرجەم دەرهاویشتەو هۆکارەکانی تۆرانی ئافرەتە ، پێش ئەوەی کە کارەکە ئالۆز بێت، و دەرئەنجامی نێگەتیڤی لێ بکەونەوە، بەڵام جاری وا هەیە، ژن بە هۆی زێدەجوانیی، یان پارەداری، و بنەماڵەوە .... هتد، تووشی لە خۆبایی بوون دەبێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَيَطْغَىٰٓ ﴿٦﴾ أَن رَّءَاهُ ٱسْتَغْنَىٰٓ ﴿٧﴾ ﴾[2]، لەم کاتەدا بە کەمی (ئامۆژگاری خێر)، کاریگەری لە سەر دەبێت، بۆیە دەبێت پیاوەکە ئامەڵەی خۆی بگۆرێت، بە گرتنەبەری هەنگاوی دووەم .

## هەنگاوی دووەم: (جوداکردنەوەی جێگای نووستن: (واهجروهن فی المضاجع):

لێرەدا (مضجع : خەوگە) بە مانای (أغراءْ: تێرکردن)ـە، لە رووی رۆحی، و سێکسییەوە، و دوورکەوتنەوەی لێی لەو حاڵەتە، شێوازێکی دەروونییە، پیاو بە کاری دەهێنێت، تا ژنەکەی ئاگادار بکاتەوە، لەوەی کە لە ئایندەدا تووشی ئەو چارەنووسە دەبێت، کە چارەنووسی نەنووستنە لەگەڵی، کە ترۆپکی نرخی پەیوەندییەکانی ژنو مێردایەتی هەر لە خۆشەویستیو رەحمەتو دڵ ئارامیی

---

١ . ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٦﴾ ﴾(التحریم:٦)، واتە: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە، خۆتان و کەس و کارتان بپارێزن لە ئاگرێك کە سووتەمەنییەکەی مەردوم و بەردە، بەسەر ئەو ئاگرەوەیە، چەند فریشتەیەکی دڵ رەقی توندوتیژی وا کە بێ فەرمانیی خوا ناکەن لەوەی کە فەرمانیان پێ ئەدا، و چ فەرمانێکیان پێ بدرێ ئەیکەن.

٢ . سورة العلق (٦ ـ ٧) ، ئاگادار بە! بە راستیی مرۆڤ، یاخی دەبێت، وستەم دەکات (٦) کاتێك کە خۆی بە دەوڵەمەندی بینی! (٧)

تێدا کۆبۆتەوە، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾[1]، واتە: هەندێ لە ڕابەر، و نیشانە ڕوونەکانی خوای مەزن، ئەوەیە کە دروستی کردووە، بۆ ئێوە، لە خۆتان، و تیرەی خۆتان، حەڵاڵ و هاوسەران، بۆ ئەوەی مەیلتان بچێ بۆ لایان و ئارامی دڵتان ببێ پێیان، و گێراویەتی لە نێوانتاندا خۆشەویستی وسۆز و بەزەیی پێتان دەربارەی یەکتر، و بە ڕاستی لەو کردەوە گرنگەی خوای مەزندا، چەند بەڵگەو نیشانەی ڕوون هەیە، بۆ ئەوانەی بیر ئەکەنەوە، و بە هۆی ئەوەوە تێ دەگەن، لە لێزانیی و کاردروستی خودا، لە دروستکردنی ئەم دوو تیرە ( پیاوو ئافرەت)، بە جۆرێك هەرکام ڕێکن، لە گەڵ ئەوی تریاندا.

- لە گەڵ ئەمەیشدا، لێرەدا پەروەردەی ئەخلاقی ئیسلامیی، فەرمان بە پیاو دەکات، کە پابەندی ئەم ڕێ‌و شوێنانەی خوارەوە بێت :

١. دەبێت دوورکەوتنەوەکە، تەنها لەو جێگایەدا بێت، تا دوو بە دوو پێکەوەن، وەك ژووری نوستن لەم سەردەمەدا.

٢. نابێت دوورکەوتنەوەکە، لەبەر چاوی منداڵەکاندا بێت، تا کاریگەری لە سەر ڕەوشتیان دروست نەکات، و تۆوی خراپە لە دەروونیاندا نەچێنێت !

٣. دەبێت دوورکەوتنەوەکە، لای خەڵکی غەریبە، و بێگانە، ئەنجام نەدات، بۆ ئەوەی ژنەکەی پێی بشکێنێت، و لە شان‌و شکۆی، و کەرامەتی کەم بکاتەوە، و بەمەش تۆرانەکە زیاتر ببێت، چونکە مەبەست لەم کارە چارەسەرکردنی تۆرانە، نەك ژێر دەستەکردنی ئافرەت، و بە زایەدانی منداڵەکان، و ئەگەر ئەم هەنگاوەیش شکستی هێنا، و ژنەکە هەر لە سەر خراپەی خۆی سوور بوو، ئەوا لە سەر پیاوەکەیە، پەنا بباتە بەر شێوازێکی

---

[1] . سورة الروم (٢١) .

تر، کە لەگەڵ دەرونیدا بگونجێت، کە ئەویش هەنگاوی سێیەمە.

## هەنگاوی سێیەم : (لێدان: واضربوهن):

هەروەك چۆن هەموو دەردێك چارەسەرێکی تایبەتی خۆی هەیە، بێگومان چارەسەری هەر یاخی بوونێکیش شێوازێکی تایبەتو گونجاوی خۆی هەیە، کە لەگەڵ قەبارەی یاخی بوون، و تاوانەکەدا بگونجێت، و بێگومان خوای گەورە کاتێك بریاری لێدانی داوە، کە پیاو لە بەردەم سێ هەڵبژاردندایە، کە چوارەمیان نییە، یان پەنا بردنە بەر دادگا، کە ئەمەش ئاشکرابوونی نهێنییەکانی خێزانی تیادایە، و حەیا چوونی بە دواوەیە، و یان تەلاَقدان، کە ئەمیش هەڵوەشانەوەی خێزانە، و یان لێدانێکی بێ ئێشو ئازار، و برین، کە دیارە لێدانەکە باشترین ڕێگایە!

و هەندێکیش بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە گرتنەبەری لێدان هەڵبژاردنێکی تەندروستو کاربەجێیانە نییە، و منیش دەڵێم: بەڵێ! لێدان بە مانا ناساغەکەی، کارێکی شیاوو ژیرانە نییە، بەلاَم ئەم ڕێگایە مانای شەڕی نێوان ژنو پیاو ناگەیەنێت، کە مەبەست لەم شێوازە شکاندنی سەری ئافرەتەکە بێت، لە کاتی تۆراندا! ئەمە بە هیچ جۆرێك لە ئیسلامدا نییە، بەڵکو ئەوە نەریتێکە لە سەردەمانێکدا، و لەگەڵ مرۆڤدا هاتۆتە کایە، و بریارەکەی ئیسلام لە رووی شکڵو شێوازەوە جیاوازە، هەروەك چۆن لە مەبەستو ئامانجیشدا هەر جیاوازە.

(لێدان)، تەلاَقدانو بەرەڵلا کردنێکی قێزەونە، بەلاَم ئەوەش هەیە، هەڵبژاردنی شەڕێکی سوکترو ئاسانترە، لە نێوان دوو شەڕدا، و ئەمەش پێغەمبەر ﷺ لە زۆر لە فەرموودەکانیدا جەختی لە سەر کردۆتەوە، لەوانە:

(لا يجلد أحدكم امرأته جلد عبد، ثم يجامعها في آخر اليوم)[1] ، واتـه: عەبدوڵلای كوڕی زەمعە‌ رضي الله عنه ،گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ژنەكانتان وەك بەندە داركاری مەكەن، دەگونجێ! هەر لە كۆتایی ئەو ڕۆژەدا دروست بن، لە گەڵیان، مەبەستی لە ڕووی سێكسییەوەیە، و دەربارەی ئەوانەیش كـە لـە ژنەكانیان دەدەن، دەفەرموێت: (و لا تجدون أولئك خيـاركم)[2]، واتـە: ئـەو جۆرە مێردانەی كە ئازاری ژنی خۆیان دەدەن، و لە سەر شتی پـڕ و پـوچ لـە ژنـی خۆیـان دەدەن، پیـاوی بـاش نـین!، و دەفـەرموێت: ( وَ لا يَضـرِب اِلاّ اَشرارُكُم :[3] لێدان تەنها كاری خراپەكارەكانتانە!) ، لەم فەرمووده پیرۆزانەوە، ئەو دەرئەنجامە وەردەگرین، كـە (لێـدان)، سـزای ژنێكـە كـە كردەوەیـەكی نێگەتیڤی ئەنجام دابێت، كە لەگەڵ ئەخلاقو دابو نـەریتی گشـتیدا پێـك نەكاتەوە، و ئەو سزایەش بە تەڵاقدان نابێت، چونكە سزا پێویستە كاریگەری تەنها لە سەر تاوانبار هەبێت، لە كاتێكدا بێگومان تەڵاق كاریگەری خراپی لە سەر هـەردوو هاوسـەر، و منداڵەكانیشـیان دەبێـت، ئەگـەر منـداڵیان هەبێت، و زیان بە خێـزانو بنەماڵـەی هـەردوولایش دەگەیـەنێت، ئەمـەش پێچەوانەی فەرمایشتی پەروەردگارە كە دەفەرموێت: (وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزۡرَ أُخۡرَىٰ )[4]، و هەروەها ناشبێت سزاكە لە دادگاوە بێت، چونكە كێشەكە گەیشت بە

---

[1] . فتح الباري بشرح البخاري، للحافظ ابن حجر العسقلاني، (باب ما يكره من ضرب النساء)، و قوله تعالى: (واضربوهن)، اى ضربا غير مبرح ٣٠٢/٩ .

[2] . نيل الأوطار، للامام الشوكاني ٢٣٨/٦ .

[3] . الطبقات الكبرى ١٤٨/٧ .

[4] . ﴿ قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِي رَبّٗا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيۡءٖۚ وَلَا تَكۡسِبُ كُلُّ نَفۡسٍ إِلَّا عَلَيۡهَاۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرۡجِعُكُمۡ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ١٦٤ ﴾ الأنعام: ١٦٤، واته: ئـەی موحەممەد! ﷺ تۆ بڵـێ لـە خـودای تـاكو تـەنیا بـەولاوە بگـەڕێم بـە دوای

دادگا، وا دەکات بلاو ببێتەوە، بە ناو خەلکدا، و بەمەش شوێنەواری خراپ لە سەر کەسایەتی خێزانەکە دروست دەکات، و پێشینە چاکەکان ئەم راستییەیان زانیوە، (قاضِي شُرَيْحْ) کە (پێشەوای بڕواداران، "عومەری کوڕی خەطاب")، لە شاری (بەصرە)دا، کردییە قازی، و (٦٣) ساڵ دادوەری کرد، کاتێك کە تورە دەبوو، و دەوروژا، لە زەینەبی خێزانی، بەو سیواکەی کە دەمی پێ سیواك دەدا، لە کاتی نوێژدا، لێی رادەوشان، و هەرەشەی پێ دەکرد، و دەیگوت:

رَأَيْتُ رِجالاً يَضْرِبُونَ نِساءَهُمْ
فَشُلَّتْ يَمِينِي، حِينَ أَضْرِبُ زَيْنَبا

پیاوانی زۆرم دیون، لە ژنەکانیان داوە، دەستم شەل بێت، ئەگەر لە زەینەب بدەم!

کەواتە، ئەو لێدانەی کە قورئان بڕیاری لە سەر داوە، ئەو لێدانە نییە، کە خەلکی نەفام بیری لێدەکەنەوە، و هێشتنەوەی ئامانج لەم سزایەدا، دوورە لەوەی کە ئەو لێدانە سزا بەخشە بێت، بە مەبەستی تۆڵە کردنەوە، و چاککردنەوەی، و هێنانەوەی تۆبزیانە بۆ سەر ڕێگای دروست!، و ڕێگا

---

خودایەکی تردا بپەرستمو بیکەمە هاوبەشی خودا، کە خودای تاکو تەنیا پەروەردگاری هەموو شتەو هیچی تر غەیری خۆی شایانی پەرستن نییە؟ دیارە نەو! بێگومان نەفسی ئینسان هەر خراپەیەك بکات زیانەکەی هەر بۆ خۆی ئەگەڕێتەوەو قازانجی پێناگەیێنێ، ئێوەیش ناتوانن گوناهی من بگرنە ئەستۆ چونکە هیچ تاوانبارێ تاوانی یەکێکی تر هەڵناگرێو هەر کەس تاوانی خۆی بە کۆڵی خۆیەوەیە، جا لە ڕۆژی قیامەتدا هەمووتان ئەگەڕێنەوە بۆ لای خوداو خودا ئەو شتانەتان بۆ ڕوون ئەکاتەوە کە خیلافتان تیایا هەبوو، لەو ڕۆژەدا ڕاستی لە ناڕاستیو چاکەکەر لە خراپەکەر جیا دەکرێتەوە.

لەمەش دەگرێت، کە وەك سوکایەتی، و ژێردەستکردن، و بە کەم گرتنی ئافرەت بێت، و هەروەها ئەوەش ڕەت دەکاتەوە، کە مەبەست بەو لێدانە ڕقە بەرایەتیو دڵ ڕەنجاندنی بێت، لە سەر ژیانێك کە پێی ڕازی نییە[1].

ئەم سێ هەنگاوە، شتی تریان بە دواوە دێت، ئەگەر تۆران لە ژنەکەوە بوو، بەڵام ئەگەر ئەمجارە لە لایەن پیاوەکەوە بوو، قورئانی پیرۆز فەرمان دەدات، بە گرتنە بەری ئەم هەنگاوەی خوارەوە .

## هەنگاوی چوارەم : (ئاشتەوایی: والصلح خیر):

قورئان ژنو مێرد ئاڕاستە دەکات، بۆ ڕێککەوتنو ئاشتەواییو پێك هاتنەوە، ئەمە هەر کات نیشانەی تۆران لە مێردەکەی دەرکەوت، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِنِ ٱمْرَأَةٌ خَافَتْ مِنۢ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا ۚ وَٱلصُّلْحُ خَيْرٌ ۗ وَأُحْضِرَتِ ٱلْأَنفُسُ ٱلشُّحَّ ۚ وَإِن تُحْسِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا )[2]، ئەمە باشترین ڕێگایە بۆ

---

[1] . في ظلال القران، سيد قطب ٥/٦٤ .

[2] . ﴿ وَإِنِ ٱمْرَأَةٌ خَافَتْ مِنۢ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا ۚ وَٱلصُّلْحُ خَيْرٌ ۗ وَأُحْضِرَتِ ٱلْأَنفُسُ ٱلشُّحَّ ۚ وَإِن تُحْسِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٢٨﴾ ﴾ (النساء: ١٢٨)، واتە: ئەگەر ژنێ لەهەڵسوکەوتی مێردەکەیەوە چاوەڕوانی ئەوەی ئەکرد کە خراپ لەگەڵیا بجووڵێتەوەو ئەترسا لەوەی مافە شەرعییەکانی جێ بەجێ نەکات، یا پشتی تێ بکاتو لە مافی خۆی کەمتر لەگەڵیا بێ قەیناکا لەناو خۆیاندا ڕێك بکەونو هەردوولایان بەپێی پێویست نەختێ تەنازول بۆ ئەوی تریان بکەن، بێگومان ڕێککەوتنو ئاشتی باش، نەك تێکچوونو ئاژاوەو لە یەك جیابوونەوە، ئەم جۆرە ناکۆکییانە ڕوودەدەن چونکە ڕژدی بەشێکە لە خووی نەفسی ئادەمیزاد، بۆیە ژنەکە خۆی پێ ڕاناگیرێو پێی ناخۆشە مێردەکەی پشتی تێ بکات و لووتەلابێ لێی،

ڕێکخستنی کۆمەڵگە، لە چوارچێوەی خێزاندا، لە کاتێکدا کە ترس هەبوو، لە ڕوودانی دیاردەی تۆرانو دووری کردن لە لایەن مێردەوە، کە ئەمەش بێگومان هەڕەشەیە، بۆ سەر ئافرەتو کەسایەتیەکەی، و مەترسیشە بۆ سەر ئاسایشو جێگیری خێزان، پێش ئەوەی کار بگاتە تەلاَقدان، کە قێزەونترین کاری حەلاَلکراوە، لە لای خوای پەروەردگار، یا پێش ئەوەی کار بگاتە ڕەها کردنی ئافرەت لە حاڵەتی تەلاَقدانو تەلاَقنەدان، قورئان هانی پیاو دەدات، کە ڕێی گونجانو یەکتر قەبووڵ کردنو ئاشتەوایی بگرێتە بەر، کە باشترین ڕێگایە بۆ خۆی، و ژنەکەیشی، و منداڵەکانیش، چونکە بۆی هەیە، هەڵەی کردبێت، لەوەدا کە ژنەکەی بێزراوە، هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا )[1] .

---

هەروەها مێردەش ناتوانێ بەسەر نەفسی خۆیا زاڵ ببێ، و مافی ژنەکەی بەتەواوی بەجێ بێنێ، جا ئێوە ئەگەر هەڵسوکەوتتان چاكو شەرعی بێو خۆتان لەکاری ناشەرعی بپارێزنو لە حەق لانەدەن، ئەوە خودا ئاگای لێتانەو بە کردەوەی چاكو خراپتان ئەزانێو هیچی لێ ون نابێ.

[1] . ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا۟ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا ۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا۟ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَـٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ﴿١٩﴾ ﴾ (النساء: ١٩)، واتە: ئەی موسوڵمانینە! بە شەرعی ئیسلام ڕەوا نییە بۆتان ژنی مردووەکانتان بە میرات بەرن، ئەو ژنانە ماڵو سامان نین تا وەکو بە میرات ببرێن، خاوەن کەرامەتو ئارەزوویان بە دەستی خۆیانە، هەروەها ڕێیان لێ مەگرن کە پاش بەسەرچوونی عیددەیان بۆ خۆیان بەگوێرەی شەریعەت شوو بکەن، ڕێگایان لێ مەگرنو بەهانەیان پێ مەگرن بۆ ئەوەی چییان لە ماڵی

ئەم چوار هەنگاوە، بۆ کاتێکە کە لایەنی خەتاکار لە نێوان ژن‌و پیاودا زانراو، و دیاری کراو بێت، بەڵام لە حاڵەتی کێشەو گرفتدا، هەریەکەیان بەرامبەرەکەی بە خەتاو هۆکاری گرفت تۆمەتبار دەکات، بۆیە قورئان فەرمان دەدات، بە دەستێوەردانی خزم‌و کەس‌وکار لە کێشەکەدا، بە مەبەستی چاکسازی کردن لە نێوانیاندا، بە شێوەیەکی دادگەرانە.

## هەنگاوی پێنجەم : دادوەری کردن (التحكيم)، (فَابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا)[1]

لە کاتی دەرکەوتنی نیشانەکانی گرفت‌و جیاوازی لە نێوان ژن‌و پیاودا، لەسەر خێزان‌و بنەماڵەی هەردوولا، و سەرپەرشتیار (ولی أمر)، یان دادوەر، یان هەر کۆمەڵەیەکی ئیسلامیی پێویستە دەست وەربداتە کێشەکە، و یارمەتی‌و هاوکاری خۆی پیشان بدات، بۆ لادانی زیانەکانی ئەو گرفت‌و

---

مردووەکە بە میرات بەرکەوتووە لێیان بسێننەوەو جا پاش ئەوە ڕێگایان بدەن شوو بکەن! ئەم ڕێ لێگرتنە کارێکی خراپ‌و ناڕەوایە مەگەر وەختێ کارێکی فاحیشە بکەن لەو وەختەدا بۆتان ڕەوایە فیدیەیان لێ وەربگرن‌و ئینجا ڕێگای شووکردنیان بدەن، هەروەها پێیان ئەفەرموێ: موعامەلەی باش لەگەڵ ژنەکانتان بکەن‌و بە چاکە بجوڵێنەوە لەگەڵیان‌و، لەبەر حەز لێ نەکردن لێیان جیا مەبنەوەو خۆگر بن، زۆر نزیکە ئێوە شتێکتان بە دڵ نەبێ‌و حەزی لێ نەکەن کە چی خودا بیکاتە هۆی خێرێکی زۆر بۆتان.

١. ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلَاحًا يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا ﴿٣٥﴾ ﴾، (النساء: ٣٥)، واتە: ئەگەر ترسان لە دوژمنایەتی‌و ناحەزی لە نێوان ژن‌و مێردا ئەوا دوو حەکەم بنێرنە لایان، یەکێ لە کەسوکاری پیاوەکەو یەکێ لە کەسوکاری ژنەکە، ئەگەر نیازیان لەسەر ڕێککەوتن بێ خودا ڕێکیان ئەخا، خودا کارەکانی پڕ حیکمەتن.

دژوارییە، بەو شێوازەی کە قورئـان فـەرمانی پێـداوە، وەك دەفـەرمویێت: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلَاحًا يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا ﴿٣٥﴾ ﴾[1]

جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە خواییە، بۆ توێژینەوەی کێشەی نێوان دوو هاوسەر، پێویستە ئەم خاڵانەی تیادا بێتە دی :

أ. دەبێت ئـەو دادوەرو بەرەڤانـەی کـە ژنەکـە دەینێرێـت، پێـی ڕازی بێـت، هەروەها بۆ پیاوەکەش بە هەمان شێوە.

ب. دەبێت هەردوو چاودێرەکە سەر ڕاستو پسپۆڕ بن، بە کاروبـاری خێـزانو گرفتەکانی.

ج. دەبێت ئەگەر گونجا لە کەسە نزیکەکانی ژنو مێردەکە بن، و ئەگـەر لـە کەسو کار نەبوو، یان نەدەگونجا، بۆ ئەو کارە، بۆ نموونە بێ ئەزموون بـوون، یان سە ڕاست نەبوونو .... هتد، لەم کاتەدا باش وایە، لە دەرو دراوسـێ داد وەربگیرێت[2]، و هۆکاری بە مەرج گرتنی ئەوەیش کـە دەبێـت ناوبـژیوان لـە خزمانی هەردوولا بێت، ئەوەیە چونکە ئەوان زیاتر ئاگادارن بە گرفتـەکانی ژنو مێردەکە، و هەر ئەوانیش بە پەرۆش دەبن، لە سەر پاراستنی کەسێتیو ناوبانگی هەردوو خێزانەکە، و زیاتریش پەرۆشو بـە خەمـەوە بوونیـان بـۆ منداڵەکانیان هەیە، و زیاتریش چاوەڕێی ئەوەیان لـێ دەکرێـت، کارەکـەیان سەرکەوتووانەتر ئەنجام بدەن.

د. دەبێت هەردوو ناوبژیوان، بێلایەنانە کار بکەن، و مەبەسـتیان چاکسـازی بێت، بە بێ جیاوازی، و پاڵپشتی کردنی لایەكو بەردانی ئەوی تر.

---

[1] . سورة النساء: (٣٥).

[2] . أحكام القرآن، لأبن العربي المالكي، ط٢، تحقيق : على محمد البجاوي، ٤٢٤/١ .

هـ. دەبێت هەردوو ناوبژیوان لەگەڵ ژن‌و مێردەکەدا، لە بارودۆخێکی ئاسایی هێمندا کۆ ببنـەوە، کـە دوور بێـت، لـە کاردانـەوەی دەروونـی‌و حاڵـەتی هەستەوەریانە، و وورده کێشەی ڕۆژانەی ژیان، و گرفتی تریش، کە هۆکار بن، بۆ لێڵ کردنی ژیانی هاوسەرێتیان!

و. دەبێت هەردوو ناوبژیوان ڕاپۆرتێکی ڕاست‌و دروست، و پوخت، و پـڕ لـە متمانە، بەرز بکەنەوە، کە هۆکارە بنەڕەتییەکانی کێشەو گرفتەکانی هەردوو ژن‌و مێرد، بە ڕوونی شی بکاتەوە، و دەربخات، و لایەنی خەتاکاریش دیـاری بکات، و دواتر لە باسی (التَفریق القَضائِي: جیابوونەوە لە دادگا)دا، دێینـە سەر ڕوونکردنەوەی ئاستی کارکردن بە ڕاپۆرتی ناوبژیوانەکان، أنشاءالله .

جا ئەگەر ئەم پێنج هەنگاوانە شکستیان هێنـا، ئـەوا ڕوون دەبێتـەوە، کـە گرفت گەلێك هەن، واز لەو ژیانی هاوسەرێتیە ناهێنن، تا بەردەوام‌و جـێگیر بێت! و لەم حاڵەتەدا دەبێت، مل کەچ بکرێت بۆ ئەو واقیعە تاڵە، کە ئەویش تەڵاقدانە، کـە ئیسـلام بوغزاندویـەتی، و بـۆ ئەوپـەڕی ناچـاری دانـاوە، و بێزراوترین‌و قیزەونترین حەڵاڵیشە، لە لای خوای گـەورە!

## هەنگاوی شەشەم : تەڵاقدان (بۆ یەکەمجار!)

لە کاتی ئەوپەڕی ناچاری‌و پێویستدا، ئیسلام ڕێگا دەدات، بە پەنا بردنە بەر تەڵاقـدان، کـە ئـەویش بـۆ (سـێ جـار) بەشـکراوە، لـەم فەرمایشـتەی پەروەردگاردا، (ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍۗ )[1]، واتە ئەو

---

[1] ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَأۡخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَا فِيمَا ٱفۡتَدَتۡ بِهِۦۗ تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعۡتَدُوهَاۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ ﴾ (البقـرة: ٢٢٩)، واتە: تـەڵاقێك کە بردنـەوەی لـە دواوەبـێ، (دوو جـارە)، ئینجـا ڕاگرتنـە بـە خۆشیی یا بەرەڵڵاکردنە بە باشیی، و دروسـت نییـە، بـۆ ئێـوە هیچیـان لـێ

تەڵاقەی کە لە دوای دەست پێکردنی ژیانی هاوسەرایەتی دروستە، بە گێڕانەوەی ژنەکە لە تەڵاقی ڕەجعیدا، و بە گرێبەستو مارەییەکی نوێ، لە تەڵاقی (بائن)دا، (دووجارە)[1]، بۆیە لە حاڵەتی هێنانەوەی ژنەکەدا، و لە گرێبەستی تازەدا، سەرپەرشتیار (ولی) بۆی نییە، ڕێگر بێت، و ڕەخنە بگرێت، لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێت: (وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوْاْ بَيْنَهُم بِٱلْمَعْرُوفِ)[2]، بێگومان زۆرینەی شەرعزانان، و ڕاڤەکارانی قورئان ئەوەیان

---

بسەننەوە ،لەو شتانەی کە داوتانن، مەگەر (هەردولا) بترسن (لەوەی) کە سنووری خوا ڕانەگرن، ئینجا ئەگەر ترسان لەوەی کە سنووری خوا ڕانەگرن، گوناهیان ناگات لەوەی کە ژنەکە لە بریتی خۆی بیدات، ئەمانەی باسکران، سنووری خوان لێیان دەرمەچن، و هەر کەسێك لە سنوورەکانی خودا دەرچێ، ئەوانەن ستەکار!

[1] . تەلاقی ڕەجعی: ئەوەیە پیاو تەلاقێکی ژنەکەی بدات، ئەو ژنەی کە پیاوەکەی بە ڕاستی چوو بێتە لای، بێ ئەوەی ئەو تەلاقە لە بەرامبەر ماڵو موڵکێکدا بێت، و تەلاقی تری لە پێشدا نەخرا بێت، یا هەریەك تەلاقی لە پێشدا خرا بێت، جا ئیتر تەلاقەکە بە ئاشکرا بێت، یان کینایە (نائاشکرا) جیاوازی نییە، و لێرەوە ئەمەش دەزانین، کە ئەگەر پیاوەکە نەچوو بێتە لای ژنەکەی بە چوونی حەقیقی، یان لە سەر ماڵ تەلاقی دابێت، یان تەلاقەکە تەواوکەری سێ تەلاقەکە بێت، ئەوە ئەو تەلاقە بائینە.

[2] . ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوْاْ بَيْنَهُم بِٱلْمَعْرُوفِ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٢﴾﴾ (البقرة: ٢٣٢)، واتە: کاتێك ژنتان تەلاقداو عیدەیان تەواو بوو ئیتر قەدەغەیان مەکەن لە شووکردن بە مێردەکانیان حەلێك کە

ڕاگەیاندووە، کە مەبەست ئەوەیە کە تـەلاقی ڕەجعـی دووجـارە! دوای هـەر جارێکیان (هێشتنەوەی ئافرەتەکەیە، بە چاکی و مامەڵەی باش لە گەڵیدا)، و گەڕاندنەوەی ژنەکەی بە بێ گرێبەستی تازە، (أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَـٰنٍ : یـان واز لێ هێنانی ئافرەتە تەلاقدراوەکە، دیسان بە شێوەیەکی جوان و بـاش بـە بـێ گێڕانەوەی)، تا کاتی بەسەرچوونی (عِدّة)ـەکەی، ڕوون دەبێتەوە لە گەڵ ڕێزی بێ پایانمدا بۆ پێگەی ئەو زانا بەڕێزانـە، بـە ڕاستی قسـەکەیان پێچـەوانەی ئـەو دەقـە پـیرۆزەی سـەرەوەیە ، لەبـەر ئـەم هۆکارانە:

١. لەفزی (تَسریح: ئازادو بەڕەڵلاکردن)، لە زاراوەی قورئانی پیرۆزدا، تـەنها مانای تەلاق ناگەیەنێت، بەڵگەیش ئەو فەرمایشتەی پـەروەردگارە، کـە لـە سوڕەتی "ئەحزاب"دا، هاتووە، کە دەفەرموێت:﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ ﴾[1]، و ئایـــەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَـٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ

---

ڕێککەوتن لە ناو خۆیانا بە باشیی، ئەمە پەندی پێدا ئەدرێ بۆ کەسـەی کـە بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی بێ لـە ئێـوەن ئـەم پەنـد وەرگرتنـەتان باشـترو پاکترە بۆ خۆتان، خوا ئەزانێ و ئێوە نایزانن.

[1] . سـورة الأحــزاب، (٢٨)، واتــە: ئــەی پێغەمبــەرﷺ بڵــێ بــە حــەلاڵ و هاوسەرەکانت ئەگەر ئێوە ژیانی دونیاتـان دەوێ بەخۆشـی ونـازو نیعمـەتی فراوانەوە داوای ڕابواردن و ئارایش ئەکەن ئەوانە لای من دەستتان ناکەوێ ، کەواتە وەرن موتعەی تەلاقتان بدەمێ و وازتان لێ بهێنم و تەلاقتان بدەم بە واز هێنانێك و تەلاقدانێکی جوان و ڕێك و ڕەواو بەبێ زیان.

وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٤٩﴾ [١].

٢. لەم دوو دەقەدا ئەوە نافامرێتەوە، کە بێژەی (سراح) بەرەڵاکردنە، بە مانای واز لێ هێنان بێت، تا (عِدّة)ـەکەی، بە سەر دەچێت، و بە تایبەتی لە دەقی دووەمدا، باسی تەلاّقی (بائن)، چونکە پێش چوونە لای ژنەکەیە! بێگومان قورئانیش هەندێکی ڕاڤەکاری هەندێکی تریەتی.

٣. ڕای جەماوەی شەرعزانانی ئیسلام کۆکە، لە سەر ئەوەی کە (تەلاّق)، و (سَراح، بەرەڵا کردن)، و (فِراق: جیابوونەوە)، و سەرجەم دەرهاویشتە زاراوەییەکانیان، لە شێوازەکانی تەلاّقی (بێ پێچ، و پەنا: صَریح)ـن.

٤. (تَسریح: ئازادو ڕەها کردن)، کارێکی باشە، لە کەسێکەوە دەرچێت، کە خاوەن بڕیار بێت، بەلاّم واز لێهێنان کارێکی خراپە، ناکرێت یەکەمیان کە باشەکەیە، بە دووەمیان کە خراپەکەیە، مانا بکرێت .

٥. ئەگەر مەبەست لە (ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ) تەلاّقی ڕەجعی بێت، ئیتر حوکمی (بائن) لە کوێدایە؟ و حوکمی ئەوەش لە کوێدایە، ئەگەر تەلاّقی یەکەم، پێش چوونە لای ژنەکە، بوو؟!

٦. ئیمامی قورطوبی دەڵێت: (أبو عومەر) وتویەتی : زانایان کۆڕان، لە سەر ئەوەی کە فەرمایشتی پەروەردگار، (أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ)، بریتییە لە

---

[١]. سورة الأحزاب، (٤٩)، واتە: ئەی خاوەن باوەڕەکان! ئەگەر ژنی خاوەن باوەڕی وەك خۆتانتان مارە کرد و پاشان بەر لەوەی توخنیان بکەون تەلاّقتان دان، ئەوە مافی هیچ عیددە بەسەر چوونێکتان بەسەریانەوە نییە پێیان بەسەربەرن، واتە: ئەو ژنانە ئەتوانن هەر دوای تەلاّقدانەکەیان شوو بکەن،چونکە ئێوە نەچوونەتە لایان و لەوانە نییە دووگیان بووبن لێتان، کەواتە دڵیان خۆش بکەن بەوەی کە نیوەی مارەییەکەیان بدەنێ و بەشێوەیەکی جوان و شیرین بەرەڵلایان بکەن، بابڕۆن بە ڕێی خۆیانەوە.

تەڵاقدانی دووەم، لە دوای کەوتنی دوو تەڵاقەکەی تر،[1] و هەر ئەمەیش ئامانجی فەرمایشتەکەی پەروەردگارە، کە فەرمووی:( فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥۗ: تا شوویەکی شەرعی تر نەکات، حەڵاڵ نابێتەوە، بۆ پیاوە یەکەمەکەی).

٧. هەروەها دەفەرمویت، لە (ئەبی رەزین)ـەوە، دەڵێت: ﴿ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥۗ ﴾، (پیاوێك هات، بۆ لای پێغەمبەرﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺئەو ئایەتەی پەروەردگار (ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ .....)، کە تەڵاق دوو جارە؟ ئەی سێیەمیان کوا؟ پێغەمبەریشﷺفەرمووی:(فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍۗ ).[2]

٨. هەروەها ڕای تر زۆر هاتوون، کە پێش لەو تێگەیشتنەی سەرەوە دەگرن، وەك لە (أَحْكَامُ القُرآن)ـی، جەصاص[3]، و (أَحْكَامُ القُرآن)ـی، (إِبْنُ الْعَرَبي مالِكی)دا، هەیە[4]، کەواتە فەرمایشتی پەروەردگار، (أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍۗ )، لە ڕاستیدا لە باسی سێ تەڵاقەدایە، و هیچ نیشانەیەکیش نییە، کە لەو مانا حەقیقی یەی خۆی لای بدات، و ئەو فەرمایشتەی تری پەروەردگار، ( فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥۗ )، ڕوونکردنەوەی ئەو حوکمەیە، کە لە سەر "تەڵاقی سێیەم"، بونیات دەنرێت، نەك ئەوانی تر، ئەو

---

[1] الجامع لِأَحْكامُ القُرآن، للأمام القرطبي، ٣/١٢٧ .

[2] عمدة القارى بشرح صحيح البخارى، ٢٠/٢٣٤ .

[3] أَحْكامُ القُرآن، للأمام أبوبكر الرازى الجصاص، تحقيق: محمد صادق قمحاوي، ٢/٨١ .

[4] أَحْكامُ القُرآن، للأمام أبوبكر الرازى الجصاص، ١/١٩١ .

حوکمەیش ئەوەیە کە، ئەو ژنە حەڵاڵ نابێتەوە، بۆ پیاوی یەکەم، تا شویەکی تر نەکات، و پیاوەکەی تر بە شەرعی بچێتە لای، ئیتر دوای ئەوە، ئەگەر بـە هۆی مردن بێت، یان بە تەڵاقدان بێت، و یان بە جیاکردنەوە لە دادگادا بێت، جیابوونەوە لە یەکتر، و دواتر (عِدَّة)یشی، تەواو کرد، لەو کاتەدا دروستە بۆ پیاوی یەکەم، کە مارەی بکاتەوە لە خۆی، ئەگەر هەردووکیان ڕازی بوون!

## ـ ئەو ڕێو شوێنانەی کە تەڵاقخۆر لە کاتی تەڵاقداندا دەبێـت، پابەند بێت پێیانەوە، و یاخود ئەرکەکانی تەڵاقـدەر، لـە کـاتی بەکارهێنانی تەڵاقدا:

کە ئیسلام ڕێگایدا، بە پیاو کە وەك دوا چارەسەر پەنا بباتە بەر تەڵاق، ئیتر وازی لێ ناهێنێت، کە بە هەوەسی خۆیو بە چ شێوەیەك دەیەوێت، مامەڵە لەگەڵ ئـەو مافەدا بکات، بەڵکو پابەندی دەکات، بەم ڕێ و شوێن و ئەرکانەی لای خوارەوە:

### یەکەم : جیاکردنەوەی سێ تەڵاقە، و دابەشکردنیان بۆ سێ جار :

ئەمەیش ئەوەیە، کە ئەم دەقەی پەروەردگاری لـە سـەرە، کـە دەفـەرموێت: (ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ )، پێشەوا جەصاص دەڵێت: "خوا دەفەرموێت، (ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ )، ئەوە دەگەیەنێت، کە بەش بەش کردنـی تەڵاق ڕێك دەکەوێت، و هەر پێکهاتی خودی تەڵاق خوازیاری ئەم حاڵەتەیە، و ئەمەیش کارێکی مەحاڵ و نەگونجاو نییە، چونکە ئەگەر دوو تەڵاق پێکـەوە بدرێت، نەدەگونجا بگوترێت، دووجار تەڵاقی دا، هەروەك ئەگەر پیاوێـك دوو درهەم ببەخشـێت، دروسـت نییـە، بگوترێـت، دووجـار بەخشـیویەتی، تـا بەخشینەکە دابەش بکرێت، ئینجا دروستە بڵێین، دوو جار بەخشیویەتی[1] ، و ئەوەیشی ووتوە، کە ئەمە مانای تـەواوی دەقـە پیرۆزەکەیـە، و درێـژەی ئـەم

---

[1]. أحكام القران، للجصاص، ٢/٧٣ ـ ٧٤ .

باسەیش لە باسی (تەڵاقی ژمارەدار)دا، دێت.

## دووەم : کات دیاریکردن (التوقیت):

لە سەر پیاو پێویستە، کە تەڵاقدان بخاتە کاتێکی دیاری کراوەوە، کە لە قورئانی پیرۆزدا، بۆی دیاری کراوە، کە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾[1]، کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا چۆن ئاخاوتنێک بەکارهاتووە، کە ئاماژەیە بۆ بایەخ پێدانو جۆشو خرۆش لە کارەکەدا.

وە سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ، کاتی عیددەی ئافرەتانی دیاری کردووە، کە دەبێت، تەڵاقدانیان، لەم کاتانەدا نەبێت :

أ. کاتی بێ نوێژی (حَیْض): دروست نییە، ژن لە کاتی بێ نوێژیدا تەڵاق بدرێت .

ب. کاتی زەیستانی (نِفاس): هەروەها دروستیش نییە، ئافرەت لە کاتی زەیستانی، واتە، خوێنی منداڵبووندا، تەڵاق بدرێت.

---

[1] . ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ لَا تَدۡرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحۡدِثُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ أَمۡرٗا ١﴾ (الطلاق:١)، واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بە مسوڵمانان بڵێ، هەر حەڵێ ویستیان ژن تەڵاق بدەن با تەڵاقیان بدەن لە عیددەیاندا، و عیددەی ژنەکانتان هەڵژمێرن، و لە خوا بترسن، ئەو ژنانە دەرمەکەن لە خانوەکانی خۆیان (تا لە عیددەدان) و خۆشیان با دەرنەچن، مەگەر کارێکی ناشیرین بکەن، ئەمانە سنوورانێکی خواین، و هەرکەسێك لە سنوورانی خوا دەرچێ بێگومان ستەمی لە خۆی کردووە، تۆ چووزانیت بەڵکو خوا دوای ئەوە کارێك بگێڕێ.

ج. لە کاتی پاکیدا، کە لە گەڵی جووت بوو بێت، دیسان لێرەشدا دروست نییە، تەڵاقی بدات، چونکە بۆی هەیە، سکی پڕ کردبێت[1].

**سێیەم : نابێت لە کاتی تەڵاقدانی ڕەجعیدا، تا ئەو ژنە عیددەکەی تەواو نەبێت، لە ماڵ بکرێتە دەرەوە، و لە ماوەی عیددەشدا دەبێت سەرجەم پێداویستیەکانی خواردنو خواردنەوەو جلو بەرگو جێگای بۆ دابین بکرێت :**

ئەمەش لەبەر فەرمانی ئەم فەرمایشتەی پەروەردگارە کە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا۟ ٱلْعِدَّةَ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ ۖ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ ۚ لَا تَدْرِى لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ﴿١﴾﴾[2]، و لە فەرمانکردنیدا بە (تَقْوى: لە خواترسان)، پێش دەرکردنی ژنەکە لە ماڵ، بێدارکردنەوەیەکی تیادایە بۆ ژنو مێرد هەردووکیان، و هەروەها لە دەستەواژەی (وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ)شدا، هەمان ئاماژە هەیە، و دواتریش دەستەواژەی (مِنۢ بُيُوتِهِنَّ ) جەخت کردنەوەیە، لە سەر بوونی مافی ژنان لەوەدا کە دەتوانن، دوای تەواو بوونی (عیددە)یش، لە ماڵدا بمێننەوە، و لە بڕگەی کۆتاییدا کە دەفەرموێت، (لَا

---

[1] . بۆ ئاگاداری زیاتر بڕوانە فتح الباری ٩/٣٤٥، کتاب الطلاق، باب قوله تعالى: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا۟ ٱلْعِدَّةَ ۖ﴾، زاد المعاد، ابن القيم ٤/٤٣، المدونة الكبرى فى فقه المالكى ٥/١٠٤، المحلى١٠/١٦٤، ونيل االاوطار٦/٢٢٦ .

[2] . الطلاق، ١ .

تَدْرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا )[1]، هۆکاری دەرنەکردنیانی درکاندووە، کە ئەویش ڕەخساندنی هەلێکە بۆ گەڕانەوەیان، و دەستکردنەوەیە، بە سۆز، و خۆشەویستی، و یەکتر لە ئامێز گرتنەوە، و ڕامان لە دەرەئەنجامەکانی جیابوونەوە، و یاد هێنانەوەی یادگارییەکانی سەردەمی پێکەوە بوون، چونکە لەو سەروبەندەدا ئافرەتەکە بە هۆی تەڵاقدانەوە، دوورکەوتۆتەوە، بەڵام کە مایەوە لەوێدا، هەر لەبەر چاوە، و نزیکە! و لە لای ژمارەیەك لە شەرعزانان وایە، کە لە ماوەی عیددەدا، پیاوەکە مافی ئەوەی هەیە، کە تەنانەت بە بێ گرێبەستێکی نوێ (چ بە قسە بێت، یان کردەوە)، ژنەکە بگێڕێتەوە لای خۆی، و لە لای هەندێك لە شەرعزانان وایە کە دەبێت، بە دەربڕینی (راجعتكِ: تۆم گێڕایەوە ژێر نیکاحی خۆم)دەری ببڕێت، و یان بە کردەوە، وەك ئەوەی کە تێکەڵییەکی وای لە گەڵدا بکات، کە مانای گێڕانەوەی لێ بفامرێتەوە، بەڵام کە عیددەکەی تەواو بوو، بە گرێبەست (عەقد)ێکی، نوێ، نەبێت، بۆی نییە، بیگێڕێتەوە.

## چوارەم : شایەت گرتن لە سەر تەڵاقدان، و گێڕانەوە:

لە سەر پیاو پێویستە کە ژنەکەی بە ئامادەبوونی دوو شایەت تەڵاق بدات، و هەروەها گێڕانەوەیش هەر بە ئامادەبوونی دوو شایەت دەبێت، تا لە تۆمەتبار کردن بە دوور بێت، و شایەتگرتنیش لەم دوو حاڵەتەدا دەقی قورئانی پیرۆزی لە سەرە، کە دەفەرموێت: ﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا۟ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ ﴾[2]، و فەرمان کردنیش بە ئامادەبوونی

---

[1] . الطلاق، ١ .

[2] . ﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا۟ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا۟ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ

دوو شایەتی ڕاستاڵ (عادل)، ئەوە دەگەیەنێت، کە ئامادەکردنیان بۆ چاودێری کارێکی (پێویست: واجِب)ـە، چونکە تا بەڵگەیەك پەیدا نەبێت، لە سەری، کە لە ڕەوتی خۆی لای بدات، هەر تەنها مانای (واجِب) بوونەکە، لە فەرمانەکەی خوای پەروەردگارەوە دەفامرێتەوە.

## پێنجەم: زۆرنەکردن لە ئافرەت، بۆ ئەوەی شتێك لە مارەییەکەی بگێڕێتەوە:

هەروەها زۆریشی لێ نەکرێت، لە سەر ئەوەی کە بڕێك لەو تێچوونە بگێڕێتەوە، کە لە سەردەمی ژیانی هاوسەرێتیدا خەرجی کردووە، لە بەرامبەر ئەمەدا، کە ئەگەر بۆی نەگونجا، ژیانی هاوسەرێتی بەردەوامی پێ بدات، پیاوەکە ئازادی بکات، بەڵام ئەگەر بە ڕازی بوونی خۆی شتێکی گێڕایەوە بۆ پیاوەکەی لە بەرامبەر تەلاقدانیدا، کاتێك ئەگەر نەدەگونجان و حەزی بە جیابوونەوە دەکرد، بە هەر نرخێك بێت، ئەو کاتە ئەو گێڕانەوەی ماڵ و هەرچی ترە، ئاساییە، و ئەم جۆرە تەلاقەش لە زاراوەی شەرعزاناندا بە تەلاقی (خولع) ناودەبرێت، و لە دواتردا بە درێژی لە سەری دەڕۆین، و خوای پەروەردگار لە دوای فەرمایشتی (ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ)دا، دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَأۡخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَا فِيمَا

---

مَخۡرَجٗا ﴿٢﴾﴾، الطلاق (٢)، واتە: ئینجا کە گەیشتنە کاتی خۆیان گلیان بدەنەوە بەباشی یا لێیان جیا ببنەوە بە خۆشیی، و دوو شاهیدی ڕاستگۆ بگرن لە خۆتان، و بۆ خوا ئەو شاهیدییە بدەن، ئەمانە (پەندێکن) کە ئامۆژگاریی ئەوانەی پێ ئەکرێ کە بڕوایان بە خواو ڕۆژی دوایی ببێ، و هەرکەسێ لە خوا بترسێ خوا ڕێی ڕزگاریی بۆ ئەکاتەوە.

أَفْتَدَتْ بِهِۦۗ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَاۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ ﴾ (البقرة: ٢٢٩)[1]، ئەم دەقە بەڵگەیە، لە سەر ئەوەی کە ئیسلام، تا چ ئاستێك سوورە، لە سەر پاراستنی ئافرەت، لەو ستەمەی کە لەوانەیە لە کاتی تەڵاقداندا، ڕووبەڕووی ببێتەوە!، و کاتێکیش دەستیان بە ژیانی ئاسایی هاوسەرایەتی کردەوە، دوای تەڵاقدانی یەکەم، و کەچی دواتر ناکۆکیو جیاوازیو گیروگرفتو لە یەکتر خراپ حاڵی بوون دەستی پێکردەوە، ئەوا لە سەر پیاوەکە پێویستە، وەك ڕێو شوێن، ئەو پێنج هەنگاوەی دوای تەڵاقی یەکەم کە ڕابورد، لە سەر هەمان ڕیزبەند بگرێتەوەبەر، و ئەگەر ئەو هەوڵانەش دیسان شکستیان هێنا، دروستە بۆ پیاو، کە تەڵاقی دووەم بەکاربهێنێت.

## هەنگاوی حەوتەم : تەڵاقدان بۆ دووەمجار:

لەم جارەیشدا لە سەر پیاو پێویستە، ڕەچاوی سەرجەم ئەو کۆتو بەندانە بکات، کە لە سەر ویست، و ئیادەی ئەو دانراون، لە تەڵاقدانی یەکەمدا، هەر لە جیابوونەوە، تا دیاری کردنی کاتەکە، و تا شایەت ئامادەکردنو هەروەها دەرنەکردنی ژنەکە، ئەگەر تەڵاقەکە (ڕەجعی) بوو، تا وەخت (عِدّة)کەی، بە سەر دەچێت، و ئەگەر لە دوای تەڵاقی دووەمیش، گەڕانەوە بۆ ژیانی هاوسەرایەتی خۆیان، ئیتر بە گەڕانەوە (ڕیجعی) بێت، لە تەڵاقی ڕەجعیدا، و یان بە گرێبەستێکی نوێ بێت، ئەگەر تەڵاقەکە (بائن) بوو، و

---

[1] . ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمْسَاكُۢ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحُۢ بِإِحْسَٰنٍۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ شَيْـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦۗ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَاۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ ﴾ (البقرة: ٢٢٩)، سەبارەت بە پێویستی شایەت پەیداکردن، سەیری (التفسیر الکبیر) للامام فخر الرازی ٣/٣٤ وأحکام القران للقرطبي، وتفسیر الطبري٢٨/١٣٧بکە .

کەچی دیسان تێوەگلانەوە، بەو گرفتو چەرمەسەرییانەی پێشوو، دیسان لـە سـەر پیـاو پێویسـتە، ئـەو پێـنج هـەنگاوەی ڕابـردوو، وەك ڕێو شـوێن بگرێتەوەبەر، جا ئەگەر دیسان سوودی نەبوو، ئەو کات بۆی هەیە، پەنا بباتە بەر تەڵاقی سێیەم، و کۆتایی!

## هەنگاوی هەشتەم، یاخود قۆناغی هەشتەم: (تەڵاقدانی سێیەم جار):

ئەگەر داواکارییە تەواوەکانی دروست بوونی ڕوودانی تەڵاقدانی سێیەم هاتنە دی، ئەوا ئەم بڕیارانەی خوارەوە دەبێت پراکتیزە بکرێن :

١. ڕێگە نەدان بە مانەوەی ژنەکە لەو ماڵەی هاوسەرایەتی کردندا، چـونکە ئەو ژنە (بائنة)یە، و نامەحرەمە .

٢. ڕێگە نەدان بە گەڕانەوەی ژنەکە، نە بە (ڕەجعی)، و نـە بـە گرێبەسـتی نوێ، لە (بەینونەی گەورەدا: البينونة الكبرى).

٣. بۆ ژنەکە دروستە، لە دوای تەواو بوونی (عِدّة)کـەی، کـە پیـاوێکی تـر هەڵبژێرێت، وەك هاوسەری ژیانی خۆی .

٤. دروستە بۆ ژنەکە، بگەڕێتەوە، بۆ لای پیاوە پێشووەکەی، بەم مەرجانـەی لای خوارەوە:

أ. ئەگەر شووی بە پیاوێکی تر کرد بێت، بە گرێبەستێکی شەرعی .

ب. دەبێـت پیـاوی دووەم چـوو بێتـە لای، و کـاری شـەرعیو سروشـتی هاوسەرایەتی لەگەڵدا ئەنجام دابێت.

ج. دەبێت، جیابووبـنـەوە لە یەکتـر، ئیتر بە مردنی پیاوەکە بێـت، یـان بـە تەڵاقدان بێت، یان بە جیاکردنەوەیان لە دادگادا.

د. دەبێت دوای جیابوونەوە لە پیاوی دووەمیش، دیسـان (عِـدّة)ـی، تـەواو کردبێت .

ئەگەر ئەم مەرجانە هاتنە دی، ئەوا دروستە، بۆ پیاوی یەکەم، دیسان هاوسەرایەتی لەگەڵدا بکاتەوە، و ئەگەر هەردوولا حەزیان لێبوویەوە، چونکە هەردوولایان بە ئەزموونێکی کرداریدا تێپەڕیان کردووە، و دوای ئەو ئەزموونە گومان دەبڕێت، ژیانی هاوسەرایەتی سەرکەوتوو ساز بدەنەوە.

## هونەری گرتنەبەری ئەو ڕێ و شوێنانە، و جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانە:

١. بێگومان تەلاقدانی سێیەم، وەك دەرئەنجامێکی حەتمی دێتە ئەژمار، بۆ ڕیشەکێش کردنو نەزۆك کردنی گرفتەکانی نێوان ژنو پیاو، و ڕێگا بۆ ئاوەلاکردن لە بەردەم ژن و پیاودا، لە لایەن شەرعەوە، و زۆر بواری فراوانتر، و زیاتر، لەمەیشی دانا، وەك ڕێگاچارە، لەوانە، (تەلاقدان، یەکگرتنەوە، جیابوونەوە، گەڕانەوە، ئینجا ڕەهاکردن)، کەچی هەر چارە نەبوو!!، جا ئەمەیش، دان پیادانانێکە، بۆ نائومێدبوونو بەردەوامیی کلۆڵیو چارە ڕەشیەکی بێ کۆتایی بۆیان.

٢. هەڵپەساردنی دروست بوونی گەڕانەوەی ژن، لە دوای تەلاقی سێیەم، بەوەی کە بچێت شوو بە پیاوێکی تر بکات، ئەمەیش یەکێکی ترە، لەو کۆتو بەندانەی کە شەریعەت، وەك سەربارێك زیادی کردووە، تا خواستو ئیرادە لە تەلاقدا بسەلمێنێت، و تەنگ بە بازنەی تەلاقدانیش هەڵبچنێت.

٣. ئەزموونی ئەو ژنە لە گەڵ مێردە تازەکەیدا، زۆر ڕاستی بۆ ڕۆشن دەکاتەوە، و دوای بەراوورد کردنی نێوان ئەو دوو ژیانە جیاوازە، دروستو نادروستی بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە ئەم ئەزموونەیش دیسان بۆ پیاوەکەیش باشە.

لە کۆتایی ئەم باسەدا، دەگەڕێمەوە سەر ئەوە، و بە خوێنەرانی بەڕێز دەڵێم، ئەم بنەما گشتییانە لە دژی تەلاقدا، سەرجەمیان قورئانی پیرۆز، زۆر بە

ڕوونی دانی پیاداناون و بێگومان قورئانیش زۆر کاریەجێیانە، و تەندروستانە هاتووە، و ڕێگا نادات بە پیاو، کە بە پەلەو هەر لە سەرەتاوە، و لە سەر بێ ماناترین و هیچترین هۆکار، هەڵسێت پەیوەندی هاوسەرایەتی بپچرێنێت، و ناشهێڵێت، ئەو پەیوەندییە ڕۆحییە پیرۆزە کۆتایی پێ بێت، مەگەر دوای ئەوپەڕی هەوڵ و کۆشش و ئەوپەڕی نائومێدی، و هەر ئەویش هاوار لە پیاوان دەکات: (وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا )[1]، بەلام لە نێوان ئەوەیدا کە قورئانی پیرۆز فەرمانی پێ دەکات، و ئەوەی ئەمڕۆ مسوڵمانان لە جیهانی ئیسلامیدا کاری پێ دەکەن، جیاوازی زۆر هەیە!!

بە داخەوە ئەوە دەڵێم، و هەموویشتان لە گەڵمدان، کە (بێگومان ئەو دەستووره مەزن و نەمرە لە جێبەجێ کردنی بە سەر زیندووواندا گۆڕاوە، بۆ گۆرانی سەر گۆڕستانەکان، و تەنها بۆ لای لایەو گۆرانی سەر مردووان بەکاردەهێنرێت !!!)؟؟؟

## حوکمی مارە بە جاش، (التحليل):

ئەم باسە زۆر پەیوەست نییە، بە باسەکانی ڕابردووەوە، هەر لە کۆتایی پێهێنانی پەیوەندی هاوسەرایەتی بە تەڵاقی سێیەم، و حەرام بوونی ژنەکەو نەتوانینیان بە دەست پێکردنەوەی ژیانێکی تر، مەگەر بەو مەرجەی کە ژنەکە شوو بە کەسێکی تر بکات، و ... هتد، چونکە مارە بە جاش (التحليل)، ئەوەیە کە ژنە تەڵاقدراوەکە بە تەڵاقی سێ بە سێ، لەگەڵ پیاوێکی تردا، ژیانی هاوسەرایەتی بونیات بنێت، لە دوای بە سەر چوونی

---

[1] . ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا۟ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا ۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا۟ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَـٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ﴿١٩﴾ ﴾ النساء: ١٩

عیـــددە، بـــە پێـــی ڕێکـــەوتنو گرێبەنـــدێك کـــە ناواخنەکـــەی ئـــەوەی لـــێ دەفامرێتەوە، کە کابرا تەلاقی بداتەوە، لە دوای سەرجێ لەگەڵدا کردنی، تا بە گرێبەستێکی نوێ حەلاڵ ببێتەوە، بۆ پیاوە یەکەمینەکەی.

**شـەرعزانانی ئیسـلام لـە سـەر حـوکمی ئـەم جـۆرە هاوسـەرێتییە، جیاوازییان تێکەوتووە، بەم شێوازەی لای خوارەوە :**

أ. (ئەبو حەنیفە)، و (موحەممەدی هاوڕێی)، دەڵێن ((گرێبەستەکە دروستە بە ڕەهایی‌و بە هەر جۆرێك بێت، ئیتر باسی مەرجی تەلاقدان لە گرێبەستی هاوسەرێتییەکەدا، و یان لە پێش ئەویشەوە کرا بێت، یان بـاس نـەکرابێت، چونکە ئەو مەرجە خۆی باتڵە، و بەلام باتڵ کەرەوە نییە، ئەمەش بە پێی ئەو بنەمایەیە کە ئەوان لە سەری دەڕۆن، کە دەڵێت: "مەرجی پڕوپوچ: فاسِد"، کار ناکاتە سەر دروستی گرێبەستێك، کە پێوەی پەیوەست بێت، ئەگەر هاتوو گرێبەستەکە هی، "سەربەسەر" مُعاوَضة"))، نـەبوو ، بـەلام سـەبارەت بـە حەلاڵ بوونـەوەی ژنەکـە بـۆ پیـاوی یەکـەم، لـە (ئەبوحەنیفـە)، دوو شـت گێڕدراوەتەوە، کـە یەکـەمیان حـەلاڵ بوونەوەکـە ڕەت دەکاتـەوە، سـەڕەرای دروستی هاوسەرێتی مارە بە جاش)[1].

وە (موحەمـــەدی، هـــاوڕێی "ئەبوحەنیفـــە")، دەڵێـــت: ( ئـــەو ژنـــە حـــەلاڵ نابێتەوە، بۆ پیاوی یەکەم، نەك لەبەر ئەوەی کە هاوسەرێتی مارە بـە جـاش

---

[1] . سـەیری کتێبـی (المیزان)ـی، پێشـەوا عبـدالوهاب الشـعرانی ۲/۹۹ بکـە، ئەوەیشی تیادا هاتووە، کە (ئەبو حەنیفـە وتویـەتی: ئەگـەر پیـاو، کـە ئـەو ژنەی مارە کرد، تا حەلالی بکاتەوە بۆ ئەو پیاوەی تر، کە "سـێ بـە سـێ"، تەلاقی داوە، و ئەوەی بە مەرج گرت کـە لـە گـەلی سـەرجێیی کـرد، و ئیتر تەلاقی بدات، و نیکـاحی پێوە نەبەستێت، بێگومـان ئـەو نیکاحـە بـە بـێ مەرجیش دروستە، و سەبارەت بە حەلال بوونەوەیشی بۆ پیاوی یەکەم، دوو گێڕانەوە لە "ئەبوحەنیفە"وە، هـەن!).

دروست نییە! بەلکو لەبەر ئەوەی کە هاوسەرایەتی گرێبەستە بۆ سەرجەمی تەمەن)، بۆیە بەو مەرجە دروست دەبێتەوە، بۆ یەکەم پیاو، کە پیاوی دووەم بـمرێت، بۆیە لە مارە بە جاشدا، ئەو حاڵەتە دروست دەبێت، کە کابرا پەلەی کردووە، لە حەڵاڵ کردنەوەیدا بۆ کەسی یەکەم، بۆیە ڕێگای ئەو ئامانجەی لێ دەگیرێت، هەروەك لە میراتگردا، میرات حەرام دەکرێت، لـە سـەری، ئەگـەر میراتدەر بکوژێت[1].

ب. (پێشەوا مـالیك)، و شەرعزانەکانی مەزهەبەکەی[2]، و (پێشەوا ئەحمەد)، و شـەرعزانەکانی مەزهەبەکـەی[3] و (زەیدییـەکان)[4]، بـە پێچـەوانەی ڕای "ئەبوحەنیفە"، و ئەوان، بیر دەکەنەوە، سەبارەت بەوەی کە ئەو هاوسـەرێتی یە بە ڕەهایی (مُطْلَقاً) دروست بێت! و دەڵێن : بە ڕەهایی پڕوپوچ و نادروستە، ئیتر چونیەکە لە گرێبەستەکەدا، باسی مەرج (شَرْطْ) کرابێت یـان نـەء ... چونکە لە کار و کردەوەدا، نیەت و نیاز، سـەنگی مەحەکـە، و بێگومـانیش نیەت لە هاوسەرێتی مارە بـە جاشـدا دیـاری کردنـی کـات (توقیت)ـی، تێدایە، و پاشان مەرجی تەلاقدانەوەیشی هاتۆتە بان!، و لە فەرموودەیشـدا هاتووە، (لَعَنَ رسولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم)، الـمُحَلِّلَ، و الـمُحَلَّلَ له)[5]، کە

---

[1] . سەیری شرح فتح القدير ١٧٧/٣ بکە، و هەروەها (شرح الهداية على العناية هامش فتح القدير)، ١٧٧/٣، الجوهرة النيرة على مختصر القدوري ١٢٩/٢، كتـاب الفقـه على المذاهب الاربعة، للجزيري ٧٨/٤.

[2] . سەیری شرح موطأ الأمام مالك للقاضي أبي الوليد سليمان الباجي ٢٩٨/٣، وبداية المجتهد، لأبن رشد ٤٨/٢، شرح الخرشي، على مختصر خليل٢١٦/٣ بکە .

[3] منتهى الارادات الامام تقى الدين محمد الشهير بأبن البخار ١٨٠/٢ .

[4] سەیری التاج لمذهب شرح متن الأزهار في فقه أئمة الأطهار، للعلامة أحمد بن القاسم العنسي اليماني الصنعاني ٢٨/٢ـ ٢٩ بکە .

[5] . رواه أبن ماجة، ١٩٢٤.

پێغەمبەر (ﷺ) نەفرەتی لەو کەسە کردووە، کە مارە بە جاش دەکات و بژیشی دەکرێت! و نەفرەتیش بەڵگەیە لە سەر حەرامێتی و پڕوپوچی ئەو کارە.

ج. (شافیعییەکان)[1]، و (ئەبویوسف)، لە "حەنەفییەکان"[2]، و (جەعفەرییەکان)[3]، و (ظاهیرییەکان)[4]، دەڵێن: ئەگەر مەرج لە گرێبەستەکەدا باسکرا، ئەوا ئەو گرێبەستە بەتاڵە، و ژنەکە حەڵاڵ نابێتەوە بۆ پیاوی یەکەم، دوای جیابوونەوەیان، چونکە مەرجێکی پڕوپوچ و نادروستکار باسکراوە، بەڵام ئەگەر باسی مەرج لە گرێبەستەکەدا نەکرا، ئەوا ئەو گرێبەستە دروستە، و مەبەستی حەڵاڵ کردنەوەکەیش دەهێنێتە دی،

---

[1]. ئیمامی شافیعی لە کتێبی (الأُم)دا، دەفەرموێت: ئەگەر ژنەکەی مارە کرد، و نیەتی هەردووکیان، یان نیەتی تەنها یەکێکیان ئەوە بوو، کە ئەوەندە پێکەوە بن، تا حەڵاڵ دەبێتەوە بۆ پیاوی یەکەم، ئەو نیکاحە دادەمەزرێت، الام ٥/٨٠.

[2]. سەیری، (شرح فتح القدیر)، و (الجوهرة)، و (الهدایة)، و سەرچاوەکانی پێشوو بکە .

[3]. سەیری شرائع الاسلام ٢/٣٢، بکە، کە تیایدا هاتووە، (بەڵام ئەگەر مەرجەکە لە گرێبەستەکەدا ڕاستەوخۆ باس نەکرا، و تەنها لە نیەتی پیاوەکە، یان ژنەکە، یان (سەرپەرشتیار: وَلي)دا، بوو، ئەو نیکاحە بەتاڵ نابێتەوە .

[4]. سەیری (مجمع فقه، إبن حزم الظاهري٢/٧٢٥)، و (المُحلی، أبن حزم١٠/١٨٠)، بکە، و تیایدا هاتووە: کە ئەگەر ژنە "سێ بە سێ"، تەڵاقدراوەکە، حەزی دەکرد، شوو بەو پیاوەی تر بکات، بۆ ئەوەی بۆ پیاوە یەکەمینەکە حەڵاڵ ببێتەوە، ئەگەر لەو گرێبەستەیدا بۆ کابرا ئەم مەرجە باس نەکرا، ئەمە دروستە، بەڵام ئەگەر مەرجی تەڵاقدان، لە دوای سەرجێیی کردن باسکرا، ئەوا ئەو گرێبەستە بەتاڵە.

و ئەگەر دوای سەرجێیی کردنیش تەڵاقیدا، چونکە نیاز، و نیەت، کاریگەری لە سەر دروستو نادروستی مامەڵە نییە.

## ڕای پەسەندکراو (الترجيح):

بە تێڕوانینی من ڕای پەسەندکراو، ئەوەیە کە دەڵێت، بە بێ چەند، و چوون مارە بە جاش نادروستو حەرامە، لە بەر ئەم هۆکارانەی لای خوارەوە:

١. مارە بە جاش خوویەکی نەفامانەیە، و ئیسلام لە سەر زمانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕەخنەی لێگرتووە، و بەرپەرچی داوەتەوە، کە فەرموویەتی،(لَعَنَ اللهُ، المُحَلِّلَ، والمُحَلَّلَ له)، (خوا نەفرەتی لە مارە بە جاشکەر، و مارە بە جاش بۆکراو، کردووە)[1].

٢. مارە بە جاش لە چەند ڕوویەکەوە پێچەوانەی ڕووکەشی قورئانی پیرۆزە، لەوانە :

أ. هانی پێکهاتنەوەی هاوسەرایەتی دەدات، بە پێکهاتنەوەی پێش تەواو بوونی (عِدّة)، و ئەمەیش کارێکی دژە ئاراستەی شەرعە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلَا تَعْزِمُوا۟ عُقْدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْكِتَٰبُ أَجَلَهُۥ ﴾[2].

---

[1] رواه أبو داود/ ١٧٧٨ .

[2] . ﴿ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُوا۟ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ۚ وَلَا تَعْزِمُوا۟ عُقْدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْكِتَٰبُ أَجَلَهُۥ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ فَٱحْذَرُوهُ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿٢٣٥﴾ ﴾البقرة / ٢٣٥ ، واتە: گوناهتان ئەگات لە قسەیەکا کەلە پەردەدا خوازبێنی ئەو ژنانە بکەیەنێ یا لە دڵیانابیێ مارەکردنیان، خوا زانیی کەئێوە ناویان ئەبەن، بەڵام بە نهێنی بەڵێنیان پێمەدەن مەگەر قسەیەك کە باش بێ، وە بڕیاری مارەکردنیان مەدەن تا عادەکەیان تەواو

ب. گرێبەستەکەی کاتی یە، بە شێوەیەك کە تەلاقدانەوە تیایدا دەبێت، هەر جێبەجێ بکرێت، لە کاتێکدا ئەوەی قورئان فەرموویەتی وا نییە، و دەبێت گرێبەستی هاوسەرێتی، گرێبەستێکی هەمیشەیی بێت، و تەلاق تیایدا تەنها (ئیحتمالی: ئەگەردانان)، بێت، واتە، (بۆی هەبێت ڕووبدات، و ڕوویش نەدات!)، هەروەك پەروەردگار دەفەرموێت: ( فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥۗ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ )[1]، و ئەگەر مارە بە جاش دروست بوایە، ئەوا قورئان دەیفەرموو، (فأن اطلقها)، (کاتێك تەلاقی دایەوە!)، چونکە ووشەی (أن) بۆ کارێك بەکاردێت، کە گومانو ڕا ڕایی تیایدا بێت، و لەفزی (أذا) بۆ کارێك دەبێت، کە بێ دوو دڵی بێتە دی!

ج. ڕێگەدان بە سازدانی هاوسەرێتی، لە پێناو بەرژەوەندییەکی ئاشکرا، و مەبەستێکی بالا، و بایەخداردایە، بەلام بەکارهێنانی هاوسەرێتی لە مارە بە جاشدا، بەکارهێنانێکە کە لەگەڵ ئەو ڕاستییە شەرعییەی خۆیدا پێك

---

ئەبێ، بزانن کە خوا ئاگادارە بەوەی کە لەدڵتانایە کەواتە خۆتان بپارێزن وە بزانن کە خوا لێخۆشبوو لەسەر خۆیە.

[1] . ﴿ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥۗ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۗ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٢٣٠﴾ ﴾ البقرة / ٢٣٠ ، واتە: ئینجا ئەگەر تەلاقی (سێهەمی)دا، ئیتر ئەو ژنە بۆ ئەو پیاوە دروست نییە تا شوو نەکات بە مێردێکی تر (بەنێجگاریی)، ئینجا ئەگەر (مێردی دووهەم) تەلاقیدا (یا مرد) ئیتر گوناه نییە، لە سەر ژنو مێردە (کۆنە)کە، کە شوو بکەنەوە بەیەك، ئەگەر بزانن کە لە سنووری خوا دەرناچن، ئەمانە سنووری خوان باسیان ئەکات بۆ گەلێك کە تێبگەن.

ناکاتەوە، و (پەنا بەخوا)، گاڵتەکردنێکە بە ئایەتەکانی پەروەردگار، و خوای مەزنیش فەرموویەتی: (وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوٗاۚ )[1].

**٣. مارە بە جاش پێچەوانەی سوونەتی پێغەمبەرە (ﷺ):**

أ. لە سوونەنی تیرمیزی، و موسنەددا، لە فەرموودەکەی ئیبن مەسعودەوەﷺهاتووە، کە دەڵێت: (لَعَنَ رسولُ الله (صلى الله عليه وسلم)، الـمُحَلِّلَ، والـمُحَلَّلَ له)[2]، (تیرمیذی)، دەڵێت: ئەم فەرموودەیە حەسەنە، و صەحیحە، و لە موسنەددا بە مەرفوعی، لە ئەبو هورەیرەوەﷺهاتووە، (لَعَنَ الله، الـمُحَلِّلَ، وَالـمُحَلَّلَ لَـهُ)[3]، و دەڵێت: سەنەدەکەی حەسەنە، و لە پێشەوا عەلی، و لە پێغەمبەریشەوە (ﷺ)، هەر بەم شێوەیە هاتووە[1].

---

[1] ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍۚ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارٗا لِّتَعْتَدُواْۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥۚ وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوٗاۚ وَٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَآ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْحِكْمَةِ يَعِظُكُم بِهِۦۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٞ ﴿٢٣١﴾﴾ البقرة /٢٣١، واتە: کاتێك ژنتان تەلاقداو گەیشتن بە ئاخرو ئۆخری عیددەیان، یا گلیان بدەنەوە بە خۆشیی، یا بەرەڵلایان بکەن بە باشیی، گلیان مەدەنەوە، بەئێش‌و ئازارەوە بۆ ئەوەی ستەمیان لێ بکەن، هەرکەسێك کاری وا بکات ئەوە ستەم لە خۆی ئەکات، وە گاڵتە بە فەرموودەکانی خوا مەکەن، وە یادی چاکەی خوا بکەن لەگەڵتاناو ئەوەی کە بەسەریان ڕشتوون لە قورئان‌و فەرموودەی بەجێ، وە لە خوا بترسن وە بزانن کە خوا بە هەمووشت دانایە، و سەیری (فتاوى شيخ الاسلام أبن تيمية) ٣٣/٦ بکە، و هەروەها تەماشای (أعلام الموقعين)ی، پێشەوا ئیبن قەییمی جەوزی، ( ٣ / ٤٣) بکە.

[2] . رواه أبن ماجة / ١٩٢٤.

[3] . نەفرەتی خودا، لەو کەسەی کە ئافرەت مارە دەکات، (مارە بە جاشکار – الـمُحَلِّلَ)، بۆ ئەوەی حەلاَلی ببێتەوە، بۆ پیاوە کۆنەکەی، و هەروەها

ب. وە لە سونەنی ئیبن ماجەدا، لە عوقبەی کوڕی عامیەوە هاتووە، کە دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ألا أخبركم بالتيس المستعار؟ قالوا : بلى يا رسول الله (ﷺ)، قال : (هُوَ المُحَلِّلَ، لَعَنَ اللهُ، المُحَلِّلَ، وَ المُحَلِّلَ لَـهُ)[2]، واتە، ئایا پێتان ڕانەگەیەنم، کە (کەڵەگای بەکرێگیراو)، کێیە؟! گوتیان، بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا،(ﷺ)، فەرمووی، ئەو کەسەیە کە ئافرەت مارە دەکات، (مارە بە جاشکار - المُحَلِّلَ)، بۆ ئەوەی حەلاڵ ببێتەوە، بۆ پیاوە کۆنەکەی، و هەروەها نەفرەتی خودا، لەو پیاوەیش بێت، کە ژنی بۆ حەلاڵ دەکرێتەوە، (مارە بە جاش بۆ کراو - المُحَلِّلَ لَهُ)!

(ئیبن قەییم)، دەفەرموێت: ئەوانەی ئەو فەرموودانە دەگێڕنەوە، لە کەسە مەزنەکانی هاوەڵانن، و شایەتییان لە سەر نەفرەت لێکراویی مارە بە جاشکەر، و مارە بە جاش پێکراو، داوە، و ئەوەیشی خوا هەواڵی لە سەر دابێت، بێگومان هەواڵێکی دروستە[3].

ج. لە (ئیبن عەبباس)ـەوە، هاتووە، کە سەبارەت بە (مارە بە جاشکار)، پرسیار لە پێغەمبەر (ﷺ) کرا، و ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی، (لا إلاّ نكاح رَغبةً، لا نكاحَ دَلْسةً، و لا إستهزاءً بِكتابِ الله، ثُمّ تَذوق العَسيلَة)[4]، هیچ نیکاح و مارەکردنێك نییە، تەنها ئەو نیکاحە نەبێت، کە بە ویست و ڕەزامەندی پێکهێنراوە، و بنیات نراوە، نەوەك نیکاحی فێڵ، و تەڵەکە، و

---

نەفرەتی خودا، لەو پیاوەیش بێت، کە ژنی بۆ حەلاڵ دەکرێتەوە، (مارە بە جاش بۆ کراو – المُحَلِّلَ لَهُ)!

[1]. زاد المعاد، لابن قيم الجوزي٥/٤ ـ ٦ .

[2]. رواه أبن ماجة / ١٩٢٦ .

[3]. أغاثة اللهفان، لأبن القيم الجوزية ٢٨٥/١ .

[4]. أغاثة اللهفان ٢٨٧/١ .

گاڵتەکردن بە پەڕتووکی پەروەردگار، تاوەکو چێژ و تام لـە هەنگوینەکـەی نەکات.

**٤. مارە بە جاش پێچەوانەی هەڵس و کەوتی هاوەڵانەﷺ:**

أ. پێشەوا عومەری کوڕی خەتابﷺ، هەر مارە بە جاشکار، و مارە بە جاش پێکراوێکیان هێنابێتە لای، بەرد بارانی کردوون.

ب. پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو طالیبﷺدەفەرموێت: (ئەو ژنە نەگێڕنەوە بـۆ لای پیاوەکەی، تەنها مەگەر بە ڕازی بوونی تەواو بێت، و گاڵتەو گاڵتەجاڕی تیادا نەبێت، بەرامبەر بە قورئان)[1].

**٥. مارە بە جاش پێچەوانەی بیروڕای تابعینە:**

(پێشەوا عَبْدُالرّزاق)، دەڵێت (إبن جُرَيْج)، پێی وتین، کە بـە (عطـاء)ـی، وتووە، کەسێکی مارە بە جاشکار، ژنەکـەی تـەڵاق داوە، و پیاوەکـەی خـۆی بردوویەتییەوە، ئەویش گوتی: دەبێت، لێك جیابکرێنەوە، و (بكر بن عبدالله الـمُزَني)، دەڵێت، ئەوانە لە سەردەمی نەفامیـدا بـە، (التـيس المسـتعار - کەڵەگای بەکرێگیـراو) ناسراو بوون[2].

**٦. (مـــارە بـــەجاش-التحليـــل)، پێچـــەوانەی بیـــــروڕای شوێنکەوتەکانی تابیعینیشە:**

(ئیسحاق)، دەڵێت، (بۆی دروست نییـە، لای خـۆی گلـی بداتـەوە، چـونکە کەسی مارە بـە جاشـکەر، هێشـتا گرێبەسـتی هاوسـەرایەتییەکەی تـەواو نەکردووە)[3]، و (پێشـەوا مالیك)ـیش، دەڵێـت: (دەبێـت لـە یـەکتر جـودا بکرێنەوە).

**٧. (مـارە بـە جـاش)، ئـەو ئامانجـەی تیـادا نایەتـەدی، کـە خـوای**

---

[1]. أغاثة اللهفان ١/٢٨٩ .

[2]. أعلام الموقعين ٣/٤٥ .

[3]. أغاثة اللهفان ١/٢٨٥ .

**پەروەردگار فەرموویەتی، (حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُۥ):**
که ئەویش ئەوەیە تامی هاوسەرێتی لە گەڵ پیاوە تازەکەدا بچێژێت، و مافی پیاوە پێشوەکە بزانێتو فێر بێت، ئەگەر هاتوو سەرپێچیکار بوو بوو، و تا پیاوەکەیش ئەو ببێنێت، لە ئامێزی کەسێکی تردا، کە وەك ژن مامەڵەی لە گەڵدا دەکات، و بۆ ئەوەی ئەمەش هۆکارەکانی پەشیمانی لە دەروونیدا بورووژێنێت، ئەگەر هاتوو هەر بە ستەمو ستەمکاری تەڵاقی دابوو، و ئەگەر لە دوای ئەوە دەستیان بە ژیانێکی نوێ کردەوە، هەردووکیان ڕەچاوی مافی یەکتری بکەن، و ئیتر ناز، و بەخششی خودا لە کۆبوونەوەی هەر دوولادا دەبینن، و لێرەوە خۆشەویستی لە نێوانیاندا بە بەردەوامی دەمێنێتەوە، و ئەم هونەرەیش نایەتەدی، ئەگەر گرێدانی هاوسەرێتی دووەم دەستکردبێت، و بە حەزی هەر دوولا نەبێت![1]

**٨. مارە بە جاش، هاوسەرێتی کاتی یە :**
چونکە لە سەر ئەو بنەمایە دادەمەزرێت، کە (مارە بە جاشکەر)، لە دوای سەرجێیی لە گەڵ کردنیدا، یەکسەر تەڵاقی بدات، و بێگومان هاوسەرێتی (کات)ـیش، لە (کۆڕا – اِجْماع)ـی، زانایانی شەرعدا بەتاڵە.

**٩. (مارە بە جاش)، هاوسەرێتییەکی مەرجدارە:**
چونکە لە سەر (مارە بە جاشکار)، پێویست دەکرێت، کە دوای سەرجێکردن، (سێکس)، تەڵاقی بدات، و ئەمەیش (مەرج)ـە، و (مەرج)ـیش، بەتاڵە!

**١٠. مارە بە جاش هاوسەرێتییەکە، کە بنەمای (ڕازی)بوونی، تیادا وونە:**
چونکە ژنەکە قەبوڵی ناکات، و ڕازی نابێت، کە کەسی، (مارە بە جاشکار)، بە هەمیشەیی مێردی بێت.

---

[1] . سەیری (الزواج والطلاق فی الاسلام)، زكي الدين شعبان، ل١٠٧ بکە.

**١١. قسـەی "شـافیعییەکان"، و "جەعفـەری"، و "ظـاهیرییـەکان"، پێچـەوانەی فەرمایشـتی پێغەمبـەرە‌ﷺ، کـە دەفـەرموێت: (اِنَّمـا الأَعمال بِالنِيات، وَ اِنَّما لِكُل اِمرِئٍ ما نَوى ......)[1]:**

(ئیبن قەییم)، دەفەرموێت: (لای زانایانی مەدینـە، و فـەرمووده ناسـان، و شەرع زانەکانیان، جیاوازی نییە، لە نێوان ئەو بە مەرج گرتنەدا، ئیتر بە قسە بێت، یان بە ڕێکەوتن و نیاز، چونکە لێرەدا نیازیش کاری پێ دەکرێت، و کردەوەیش بە نیازو نیەتە، و لـەفز تـەنها، بـۆ دەلالـەت کردنـە، لـە سـەر مانایەك، بۆیە حوکمی لە سەر بونیات دەنرێت[2].

جا کە مانا، و مەبەستەکان، دەرکەوتن، هیچ جێگایەك بۆ لەفز نامێنێتەوە، چونکە لەفز، و دەربڕینەکان ئامرازن، و ئامانجەکە بۆ خۆی هاتە دی.

---

[1]. صحيح البخاري ١/ .

[2]. زاد المعاد ٦/٤ .

## ﴿بەشی دووەم﴾
## تەڵاقی هەڵپەسێردراو ( الـمُعَلّق )
## لە شەریعەتی ئیسلامدا

پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلّم"، دەفەرموێت:
(ومَنْ يَعْمَل عَمَلاً لَيس عَلَيْهِ أَمْرُنا فَهُوَ رَدٌّ)
(مسلم/ ٣٢٤٣).
هەرکەسێك كردەوەیەك ئەنجام بدات، بە فەرمانی ئێمە نەبێت، ئەوە لێی وەرناگیرێت، و ئەدرێتەوە بە سەریدا.

## پێشەکی:

ئەم نامیلکەیە، لە پەرتووکی، (مدى سلطان الارادة في الطلاق في الشـرائع والقوانين والأعراف خـلال أربعـة آلاف سـنة)[1]، هێناومانـە، کـە ئـەویش نووسراوی خۆمە، لە بەر چەند هۆیەك، لەوانە:

١. گرنگیی بابەتەکە، سەبارەت بە بەردەوامبوونی ژیانی خێزان.

٢. شەرعزنانی ئیسلام کۆکن، لە سەر ئـەوەی کـە گشـت هەڵسـوکەوتێکی شـەرعی، (لـە گرێبەسـتەکان، وەك: کـڕین و فرۆشـتن)، و (لـە "ویسـتی سـەربەخۆ، و تایبـەت"، وەك بەخشـین)، ئەگـەر هـاتو بـە (مـەرج - شَرْطْ)ێکەوە، هەڵپەسێردرا، ئەوە بەتاڵە، بێگومان ئەم یاسایە هاوسەرێتیش دەگرێتەوە، بۆیە هاوسەرێتیش ئەگەر بە (مەرج)ێکەوە، هەڵپەسـێردرا، بـە کۆڕای زانایان بەتاڵە، ئەمـەش لەکاتێکدایـە، کـە زانایـان هەڵپەسـاردنی تەڵاقیان لە سـەر (مـەرج)، و کـەوتنی تەڵاقیشـیان لـە کـاتی هاتنـە دی مەرجەکەدا بە دروست زانیوە، بـە لەبـەر چـاوگرتنی ئـەوەیش کـە تـەڵاق، ترسناکترین هەڵسوکەوتێکە کە مرۆڤ سەرپشك کراوە بەکاری بهێنێت! کە لە ڕاستییدا کیانی خێزان دەڕوخێنێت، و ئایندەیان لە ناو دەبات، لەکاتێکدا کە خێزان خانەی یەکەمی کۆمەڵگەیە، ئەگەر هاتوو، خراپ بوو، کۆمەڵگەیش خراپ دەبێت، ئەو خراپییەش بە گشت لایەکـدا تەشـەنە دەکـات، و ئەگـەر تەندروستیش بوو، ئەوە تێکڕای کۆمەڵگە تەندروست دەبێت، و شکۆمەندیی گشت لایەك دەگرێتەوە.

---

[1] (مدى سـلطان الارداة فـي الطـلاق، فـي الشـرائع و القـوانين و الاعـراف خـلال أربـعـة آلاف سنة)، ل ٢١٩ – ٣٠٥.

٣. ئەوەی بە وردی و بە قوڵی، لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، و فەتوا و قەضاوەتی خەلیفە ڕاشیدینەکان، (رضِيَ اللهُ عَنهُم) ڕابمێنێ، تەنها دەقێك نابینێت، کە پەیوەندیی بە هەڵپەساردنی تەلاقەوە هەبێت، لە سەر (مەرج)، تەنها ڕووداوێکی "تەلاق هەڵپەساردن"یش، لە سەر مەرج، بەرچاو ناکەوێت.[1]

٤. شەرعزانانی ئیسلام کۆڕان، لە سەر ئەوەی کە سوێند خواردن، بە غەیری زاتی پەروەردگار و صیفاتەکانی بەتاڵە، بێگومانیش ئەوەی لە سەر بەتاڵ بنتیات بنرێت، ئەویش بەتاڵە.

٥. سەرەڕای ئەمەش بە دروستیان زانیوە، سوێند بە تەلاق بخورێت، و بڕیاریشیان لە سەر کەوتنی تەلاق داوە، لەکاتی کەوتنی سوێندەکەدا، و لێرەیشدا ناکۆکیی و جیاوازییەکی بێ بەڵگە، و بێ پێچ و پەنا هەیە.

٦. تەلاقی هەڵپەرسێردراو بە (مەرج)، و سوێندخواردن بە تەلاق، بنەمایان نییە، لە شەریعەتی ئیسلامدا، و بەڵکو لە سەردەمی دەسەلاتی ئەمەوییەکاندا داهێنراون، هەروەك ڕوونکردنەوەی ئەم باسە، لە جێگای خۆیدا دێت.

---

[1] بە بەڵگەهێنانەوەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێت: (المسلمون عند شروطهم) بەتاڵە، چونکە مەبەست لە (مەرج) لەم فەرموودە پیرۆزەدا، ئەو مەرجانەن کە بە گرێبەست هەن، نەك ئەو مەرجانەی کە بە هەڵپەسێردراوی هەن، لە لایەن کەسی ژیریش هەست بەو جیاوازییەی نێوان ئەم دووانە دەکرێت.

## ( حوکمی هەڵپەساردن لە دارشتە ( صیغة )ـی تەلاّقدا )

صیغەی تەلاّق دوو جۆرە: (کۆتـایی پـێ هێنـان - دەسـبەجێ: التَنْجِـز) ، و (هەڵپەساردن: التَعلیق) ، و هەڵواسینیش جاری وا هەیە ، دەبێتە (سـوێند - الحِلْفْ) ، و جاری وایش هەیە ، وەك تەنها (مەرج)ێکی، ڕووت دەمێنێتەوە.

- کۆتایی پێهێنان (التنجیز) : سەرجەم ئەو دەسـتەواژانە دەگرێتـەوە، کـە پیاوەکە مەبەستی پێی کەوتنی تەلاّقەکـە بێـت، لـە کـاتی دەربڕینـی ئـەو دەستەواژەیەدا ، وەك ئەوەی پیاوەکە بە ژنەکەی بڵێت: (أَنـتِ طـالقٌ، تـەلاّقت کەوتبـێ).

- حوکمەکەیشی ئەوەیە کە، لەو کاتەدا ، و دەم و دەس، تەلاّقەکە دەکەوێت، ئەگەر سەرجەم پایە و مەرجەکانی هاتنە دی، و ئەصلیش لە تەلاّقدا ئەوەیە کە ، بە دارشتەی کۆتاییپێهێنان (صیغة التنجیز) بێت، چونکە شەرع تەلاّقی بۆ کاتی (پێویستی) ، داناوە، و کە ئەمەیش ئەوە دەخوازێت، و لە سەر ئـەم بنەما ئەصلیەیشە ، کە زانایان گوتوویانە ، "تەلاّق"، تەنها لە کاتی (کۆتایی پێهێنان: تَنجیز)دا ، دەکەوێت.

- هەڵپەساردن – هەڵواسیـن (التعلیق): بریتییە لە پەیوەستکردنی ئەوەی لـە کرۆکی ڕستەیەکدا هەیە، بە کرۆکی ڕستەیەکی ترەوە، وەك ئەوەی پیاو بە ژنەکەی بڵێت: (ئەگەر گەردنم ئازاد بکەی، لە مارەییە قەرزەکەت، تەلاّقت کەوتبـێت).

- هەڵواسین بە سوێند (التعلیق الحِلْفِي): ئەمەیش بریتییە لە سووربوون لە سەر کردن، یان نەکردنی کارێك، بێ ئەوەی ژنەکە هیچ ویست و ئارەزوویەکی لەو تەلاّقەدا هەبێت، وەك ئەوەی بڵێت: (بە تەلاّقم ئەو کارە هەر دەکەم) ، یان بڵێت: (تەلاّقم نەبێت، ئەگەر ئەو کارە نەکەم) ، یان چەندەها دەستەواژەی تر، کە لە ناو خەڵکدا باون، و بلاّون.

بـۆ ڕوونکردنـەوەی زیـاتریش لـە سـەر (هەڵواسـینی رووت : التعلیـق الـمَـحْضِي) ، و (هەڵواسینی سوێنددار: التعلیق الحِلْفـي) ، هەریەکـە و بـە بەشێکی سەربەخۆ لە سەریان دەدوێین.

# بەشە باسی یەکەم
# حوکمی هەڵواسینی ڕووت (التعليق المَحض)

شـەرعزانەکان دەربـارەی ئاسـتی دەسـەڵاتی پیـاو ـ یـان ئـەوەی لـە جێـی دادەنیشێت ـ، لە هەڵواسینی تەڵاقدا، جیاوازییان هەیە، لە سەر چوار ڕا:

**ڕای یەکـەم: تـەڵاقێك کۆتـایی پـیّ هێنـراو (المُنجَـز) نـەبێت، ناکەوێت:**

واتە، هەموو هەڵواسینێك لە تەڵاقدا بەتاڵە، و هیچ شوێنەوار و بڕیـارێکی شەرعیـی، سەبارەت بە کەوتنی تەڵاق، لە سەر بنیات نانرێت، و ئەوانەی ئەم ئاڕاستەیەیان هەڵبژاردووە، (جەعفەرییەکان)، و (ظاهـیـرییەکان)، و "أبـو عَبـدالرحمن"، لە (شافیعییەکان)، و هەندێ لە شەرعزانانی (حەنبەلـی)، و "أشهَب"یشە، لە زانایانی (مالیکی)، بەو مەرجـەی کـە ئـەو ژنـە (کـارە هەڵواسراوەکە: الـمُعَلّق)ـەکە، بە مەبەستی کەوتنی تەڵاقەکە، ئەنجام بدات، و ئەم ڕایە دراوەتە پاڵ ( پێشەوا عەلـی کوڕی ئەبی طـالیـب)، "رضـي الله عنه"، و (قازی شوڕەیح)، و (طاووس)، و (عیکرەمە)، و (عـەتا)، و (ئـەبو ثەور).

## * جەعفەرییەکان:

لە کتێـبـی (خلاف)دا، هاتووە: تەڵاق ئەگەر بە (مەرج)، یان (صـیفەت)، تەعلیق کرابێت، ئەوە هەرگیز ناکەوێت، نە "ئێستا"، و نـە "ئاینـدە"، لـە کاتی هاتنەدی مەرج و صیفەتەکەدا.[1]

---

[1] الخلاف في الفقه، للطوسي ، ٢/٢٣٠.

- بەڵگەشیان بۆ ئەم ڕایە چەند شتێکە، لەوانە:

١. کۆڕای زانایانی ئەم دەستەیە، و لێدوانەکانیان لەم بارەیەوە، چونکە لەو شتەدا ناکۆکییان نییە.

٢. ئەصڵ تێیدا هێشتنەوەی گرێبەستەکەیە، و کەوتنی ئەم جۆرە تەلاقـەیش پێویستی بە بەڵگە هەیە، و شەرعیش ئەم جۆرە شتەی تێدا نییە.

٣. ڕووکەشی بەڵگەی قەتیسکردن، و تەنگ پێ هەڵچنیـن، لە دەستەواژەی، (تەلاقت کەوتبـێ ـ أنتِ طالقٌ)دا، ئەوە دەگەیەنێت، کە لە دەستەواژەکەدا، گشتگیری و ڕەهایی، زاڵتـرە بە سەر، (هەڵپەساردن - التَعليق)، تیایدا.

٤. دەڵێن، بە تەنها بوونی مەرج ناکەوێت، چونکە پەیوەندی لـە نێوانیانـدا نییە، و بە تەنها هاتنەدی بەشە ڕستەی دووەمی پەیوەست بـە مەرجەکـەوە، کە (جزاء)ـی، پێ دەگوترێت، ناکەوێت، چونکە تەعلیقەکە لە سەر ( مەرج - شَرْطْ) کراوە، نەك (جَزاء)، و هەروەها بە هەردووکیشیان نـەکراوە، واتـە (شَرْطْ، و جَزاء)، چونکە پێکەوە کۆ نابنەوە ، چونکە لە کاتی (جـزاء)دا، (شَرْطْ) نییە، و بە کاروباری دەرەکیش ناکرێت، چـونکە ناچـێتە عەقڵـەوە، بۆیە بەتاڵە.

٥. دەڵێن، لە کاتی هاتنەدی (شَرْطْ)ـەکەدا، ئیتر لەفزی تەلاق بوونی نابێت، ئیتر چۆن دەکەوێت؟[1]

## * ظاهیرییەکان:

ظاهیرییەکان دەڵێن: تەلاق ئەگەر تەلاقی کۆتاییپێهێنەر (الـمُنجز) نـەبێت، ناکەوێت، بۆیە ئەگەر تەلاق هەڵپەسێردرا، بە (مەرج)، یان (بەستییـەوە بە

---

[1] الروضـة البهيـة شـرح اللمعـة الدمشـقية، ب٢، ل١٤٧ – ١٤٨، شـرائع الاسـلام ٥٦/٢، المختصر النافع ص٢٢٢، مسـتدرك الوسـائل ٦/٣ ، ريـاضُ المسـائل، بەرگی دووەم، كتاب الطلاق.

کاتێکەوە)، ئەوە بەتاڵە، بەڵگەیشیان ئەوەیە کە:

١. نە لە قورئان، و نە لە سوننەتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)، تەڵاقی لەو شێوەیە، (کۆتایی پێ نـــەهێنەر) نەهاتووە، و ئەوەی کـە هەیــە، هــەر تەڵاقی ڕاستەوخۆ، و دەسبەجێ و کۆتایی پێهێنەرە، و بە دروسـت زانینــی تـــەڵاقی (هەڵپەسـێردراو – الـــمُعَلَّق)، تێپەڕانــدنی ســنوورەکانی خــوای پەروەردگارە:(وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ ).[1]

٢. هەروەها لە بەر ئەوەی، کە ئەگەر تەڵاق لە کـاتی خسـتنی دا نەکـەوت، ئەوە ناکرێت، کە لە کاتێکی تردا بکەوێت، کە ئەو کـاتی دووەمــە، کـاتی خستنــی تەڵاقەکە نەبــووە.[2]

## * شافیعییەکان:

(پێشەوا ئیبن قەییمی جەوزی)، دەفەرموێت: (ئەبوعەبدوڕەحـمان، ئەحمەدی کوڕی یەحیای کوڕی عەبدولعەزیز)، کە لـە هـاوڕێ مەزنـەکانی (ئیمـامی

---

[1] ﴿وَإِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمۡسِكُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٖۚ وَلَا تُمۡسِكُوهُنَّ ضِرَارٗا لِّتَعۡتَدُواْۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوٗاۚ وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَمَآ أَنزَلَ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡحِكۡمَةِ يَعِظُكُم بِهِۦۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٢٣١﴾﴾ (البقرة : ٢٣١)، واتە: کاتێك ژنتان تەڵاقداو گەیشـتن بـە ئـاخرو ئۆخری عیددەیان، یا گلیان بدەنەوە بـە خۆشـیی، یـا بـەرەڵڵایان بکـەن بـە باشیی، گلیان مەدەنەوە، بەئێشو ئازارەوە بۆ ئەوەی ستەمیان لـێ بکـەن، هەرکەسـێك کـاری وا بکـات ئـەوە سـتەم لـە خـۆی ئـەکات، وە گاڵتـە بـە فەرموودەکانی خوا مەکەن، وە یادی چاکەی خوا بکەن لەگەڵتاناو ئەوەی کە بەسەریان ڕشتوون لە قورئانو فەرموودەی بـەجێ، وە لـە خـوا بترسـن، وە بزانن کە خوا بە هەموو شت دانایە.

[2] الـمحلی، لإبن حزم الظاهري، ١٠/٢١٣.

شافیعی)یـــە، دەڵێت، تەڵاقی (هەڵواسراو - الــمُعَلّق)، بـە هـیچ جۆرێـك ناکەوێت، لەم ڕایەشدا تـەنیا خـۆی نییــە، و بـەڵکو ژمارەیـەکی تـر، لـە زانایانیش فەرموویانە.[1]

## * مالیکییەکان:

(ئەشهەب)، کە شەرعزانترینی هاوەڵانی (پێشەوا مـالیك)ـە، دەڵێت: بە هیچ جۆرێك تەڵاقی هەڵواسراو ناکەوێت، ئەگەر هاتوو ژنەکە ئەو کارەی ئەنجامــدا، کە هەڵپەساردنەکەی لە سەر کرابوو، بە مەبەسـتی ئـەوەی تەڵاقەکـە بکـەوێت، ئەمەش لەو بنەمایانەیە، کە لە لای مەزهەبی (پێشەوا مالیك)، کاریان پێکراوە، و لەمەدایە کە مرۆڤ دژی ئامانجەکەی بۆ دەهێنرێتە دی، وەك ئـەوەی کـە بکوژ ناتوانێت، میرات لە کوژراو ببـات، و ژنێـك کـە لـە کـاتی نەخۆشـی مردندا تەڵاق درابێت، هەر میرات دەبات.[2]

## * حەنبەلییەکان:

(ئیبن تەیـمییە)، و (ئیبن قەیـیم)، لە کەسە مەزنەکانی ئەو کۆمەڵەیەن، کە ڕایان لە سەر ئەوەیە، کە تەڵاقی (هەڵپەسـێردراو - الــمُعَلّق)، ناکـەوێت، ئەگەر مەبەست پێی ڕاکێشانی کەسەکە بێت، لە سەر کردن، یان نـەکردنی کارێك،[3] و ئەم ڕایەش دراوەتە پاڵ (پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو طـالیبﷺ)، و ژمارەیەك لە (تابیعیــن – شوێنکەوتووانﷺ)، و "شێخ عەلی خـەفیف"، دەڵێت: ژمارەیەك لە شەرعزانان وای بۆچوون، کە (هەڵپەساردن - التعلیق)، بەتاڵە، تەنها تەڵاقی (کۆتایی پێهێنەر – الــمُنجز)، لـە شـەرعدا هەیـە،

---

[1] أعلام الـمُوقعين، ٤/١٠١.

[2] أعلام الموقعين، ٤/٩٧.

[3] مجموع فتاوى، لِشيخ الاِسلام، اِبن تيمية، ٣٣/ ٢٢٣.

ئەمەش ئەوەیە کە ئەم ئایەتە پیرۆزە بەڵگەیە، لە سەری، کـە دەفـەرموێت، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ لَا تَدۡرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحۡدِثُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ أَمۡرٗا ١﴾.[1]

بێگومان فەرماندان بە تەلاق، لە کاتێکی دیاری کراودا، نیشانەی ئەوەیـە، کە دەبێت (کۆتایی پێهێنەر - الـمُنجز)، بێـت، لـەو کاتـەدا، وە تـەلاقی (هەڵپەسێردراو) ناشەرعییە، و بەرپەرچدراوەتەوە، و هیچ حوکمێکیشی لـە سەر بنیات نانرێت، و ئەمەیش لە (پێشەوا عـەلـی، "ڕەزای خوای لێ بێت")، و (طاووس)، و (ئەبی ثـەور)ـەوە، گێردراوەتەوە[2].

## ڕای دووەم: تـەعلیق بەتاڵـە، بـەڵام بەتاڵکـەرەوە نییـە، و لـەو کاتەیشدا دەکەوێت!

زانایانی پشتگیر لەم ئاڕاستەیە پێیان وایـە، کـە تـەعلیقی تـەلاق بەتاڵـە، چونکە خراپە بە شوێن خۆیدا دەهێنێت، و شـوێنەواریش دەسـڕێتەوە، بـەڵام بەتاڵکـەرەوە نییـە، و تەلاقەکـەی لـەو وەختـەدا، و لـە کـاتی دەربڕینـی دەستەواژەکەدا، پێ دەکەوێت، و ئەمـەیش یەکێکە، لەو دوو ڕیوایەتەی، کـە لە (پێشەوا مـالیك)ـەوە، گێردراوەتەوە، و قسەی کۆمەڵێکیشە لە تابیعیـن، و مەزهەبی (ئیبـاضی)یـەکـانیش، بـەم جۆرەیـە، لـە هەنـدێ کاتـدا، و بەڵگەیشـیان ئەوەیـە، کـە دەڵـێن، ئەگـەر لـەو کاتـەدا نەکـەوێت، ئـەوا دروستبوونی سەرجێ کردنی کاتیی (مُؤَقّت)ـی، تیادا بەرجەستە دەبێـت، و

---

[1] (الطلاق : ١ ).

[2] (فرق الزواج)، للاستاذ الشيخ علي الخفيف، ل١١٢.

ئەمــەیش دروســت نییــە، لــە شــەرعدا، چــونکە پیــاو حەڵاڵبوونەکــەی بەستووەتەوە، بە (کات)ێکەوە، کە لە لای خۆیەتی، و نیکاحی (متعة)یش، بە هۆی ئەو (کات)، دیاری کردنەوەیە، بۆیە نادروستە، چونکە (کات)ــی، تێدا دیاری کراوە.

## * تابیعییەکان:

(ئیبــن قودامــە)، دەڵێت: (ســەعیدی کــوڕی موســەییب)، و (حەســەن)، و (زوهری)، و (قەتادە)، و (یەحیا)، و (ئەنصاری)، و (ڕەبیعە)، و (مالیك)، " خوا لە هەموویان ڕازی بێت"، دەڵــێن: ئەگــەر تــەڵاق هەڵواســرا، بــەڵام بــەو شێوازەی کە پێکهاتنەوەی لێ چاوەڕوان نــەکرێت، وەك ئــەم گوتەیــە، (تــۆ تەڵاقت کەوتبــێ، ئەگەر خۆر دەرهات)، ئەوا لەو کاتەدا تەڵاقەکە دەکەوێت، چونکە نیکــاح ناکرێــت، بــە (کات)ــەوە، ببەســترێتەوە، و هــەر لــە بــەر ئەمەیشە، کە دروست نییە، بۆ مانگێك مارەی بکات.[1]

## * مالیکییەکان[2]:

(مالیکییەکان)، دەڵێن: (تــەڵاقی کۆتاییپێهێنــەر- الــمُنجز)، دەکــەوێت، ئەگەر هەڵپەسێردرا، بە مەرجی ڕابردوویەکەوە، کە لە ڕووی عەقڵ و عادەت و شەرعیشەوە، هاتنەدی مەحاڵ بێت، و هەروەها ئەگەر هەڵواسرا، لە سەر کارێك، لە داهاتوودا، کە ئەو کارە هاتنەدی بۆ هەبوو، بە دڵنیاییەوە، وەك، (تۆ تەڵاقت کەوتبێت، دوای ساڵێك)، ئەمە کۆتایی پێهێنانی لە سەر بنیات دەنرێت، چونکە لەم کاتەدا، لە (گرێبەستی هاوسەرایەتی کــاتــی - نیکاحی "مُتْعَــة" – سیغە)، دەچێت، و هەروەها ئەگەر تەلاق هەڵواسرا، بە شتێکەوە،

---

[1] الـمُغنــي والشرح الكبير، ٨/٣١٨.

[2] شرح الخرشي، ٤/٥٤.

کە خۆڕاگرتنی لە سەر نەدەکرا، و دەبوو، لە حاڵەتێکیاندا، هەر دۆش دابمێنێت، وەك بڵێت، (ئەگەر هەڵسایت، یان دانیشتیت)، واتە، کاتی دیاری نەکرد، بەڵام هەر تەلاَقی دەکەوێت، چونکە ئەوەی کە حاڵەتەکانی تێدا دیاری نەکرا، وەك (هاتبێتە دی) وایە ، هەروەها ئەگەر تەلاَقی هەڵپەسارد، لە سەر شتێك کە نەگونجێت، بزانرێت لەو کاتەدا، وەك بڵێت، (ئەگەر بە کچ سکت پڕ بوو، تەلاَقت کەوتبێت)، هەر تەلاَقی دەکەوێت، و هەروەها ئەگەر تەلاَقەکەی هەڵپەسارد، لە سەر، ویست و شتێکی نادیار، وەك بڵێت، (تەلاَقت کەوتبێت، (ان شاء الله!!)، و هەروەها دەڵێت، تەلاَق ئەگەر هەڵپەسێردرا، بە داهاتوویەکەوە، کە هاتنە دی مەحاڵ بوو، ناکەوێت، وەك ئەوەی کە بڵێت، (تەلاَقت کەوتبێت، ئەگەر دەستت دا، لە ئاسمان).[1]

وە ئەوەی کە (دکتۆر عەبدوڕەحمان صابونی)، لە کتێبی (مدى حرية الزوجين في الطلاق)[2]دا، دەیلێت، کە ئەگەر تەلاَق هەڵپەسێردرا، بە کارێکەوە، کە مەحاڵ بێت، بێتە دی، ئەوا ئەو تەلاَقە، لای "مالیکییەکان"، ناکەوێت!، ئەم قسەیە بە شێوەیەکی گشتی دروست نییە، چونکە جیاوازیی نەکردووە، لە نێوان هەڵپەساردنێك بە ڕابردوویەکەوە، کە مەحاڵ بێت، بێتە دی، و بە داهاتوویەکەوە کە دیسان هاتنە دی مەحاڵ بێت، بۆیە لە حاڵەتی یەکەمدا، هەر لە هەمان وەختدا دەکەوێت، وەك ئێستا باسمان کرد، و لە (پێشەوا مالیك)ـیشەوە، دوو ڕیوایەت هاتووە، دەربارەی هەڵپەساردنی تەلاَق، بە کارێکەوە کە بۆی هەبێت، بێتەدی، بۆ یەکەمیان لە گەڵ (حەنەفی)، و (شافیعییەکان)، هاوڕان، و دەڵێن، تەلاَق لە کاتی هاتنە دی مەرجەکاندا دەکەوێت، بۆ ئەوی تریشیان ڕایان وایە، کە هەر لەو وەختەدا

---

[1] هەمان سەرچاوە، شرح الخرشي، ٤/٥٤.

[2] الصابوني: مدى حرية الزوجين في الطلاق، ١/١٩٣.

دەکەوێت[1]، جا لەوەی گێڕامانەوە، ئەوە وەردەگیرێت، کـە (مـالیکییـەکان)، ئەگەرچی بە دڵنیاییەوە، دانیان بە هەڵواسینی تەڵاقدا ناوە، بەڵام ئەوەشیان بە هەند وەرگرتووە، کە دەبێت لە هەندێ کاتدا ئـەو تەڵاقـە، بـۆ (کۆتـایی پێهێنان: تَنجیز) بێت، و لـە هەنـدێ کاتیشـدا، ڕێگـر بێـت، لـە کـەوتنی تەڵاقەکە، وەك هەڵپەساردنی تەڵاق بە داهاتوویەکەوە، کە هاتنە دی مەحاڵ بێت، یان ببەسترێت، بە خواستنێکی نەزانراوەوە!

## * ئیباضییەکان:

(ئیبـاضـییەکـان)، دەڵـێن، لـەو وەختـەدا، تەڵاقەکـە دەکـەوێت، ئەگـەر هەڵپەسێردرابوو، بە شتێکەوە، کە بۆی هـەبێت، بێتـە دی، بـەڵام لـە ڕووی شەرعیشەوە قەدەغە بێت، و یان هەڵپەسێردرابوو، بە شتێکەوە، کە نەبێت، وە یان لە ڕووی عـەقڵ، و نەریت، و عادەتەوە یاسـاغ بێـت! ئـەوا دەسـبەجێ تەڵاقەکە هەر دەکەوێت، وەك لە (جـوهـر النـظـام)ـدا،[2] هاتووە:

| | |
|---|---|
| وَ إن يُعَلقُه بِـمُـمْـكِنٍ مَـنَـع | وُجوده شرْعاً، فَـحالا يَقَع |
| وَ إن بِـمـعدومٍ يُـعلِـقُـنـا | فَإنّها بِالـحـال تطلِقنَا |
| كَقَوْلِ مَـنْ قـالَ: إذا شَـربتِ | ما دَخَل الكوُز، فَـقَد طَلقَت |
| وَ لَـمْ يَكُن بِالكوُزِ، شَيـء يَشْرَب | فَإنّها تطلِق، ثُـمّ تَذهَبُ |
| إذ يَقَعُ الطَـلاقُ وَالتـعليـقُ | يلْغِي فَلا يُـعَـلِقُ التَطليقُ |
| وَمِثْله الشَـرْطُ الّذِي لَـمْ يـقـدّر | عَلى وُقوُعِـهِ صُنوُفَ البَشَر |

---

[1] بداية المجتهد ونهاية المقتصد، لإبن رشد، ٢/٦٥.

[2] جوهر النظام، ٢/٢٢٠، و دواتر.

**ڕای سێیەم: ئەم ڕایە درێژەی هەیە، و دەبێتە دوو بەشەوە، لە لایەکەوە لەگەڵ ڕای دووەمدا، و لە لایەکی تریشەوە، لە گەڵ ڕای چوارەمدا یەکدەگرێتەوە:**[1]

ئەم ڕایەش ئەوەیە، کە تەلاقی هەڵواسراو (هەرسێکیان)، لەو کات و حاڵەتەدا دەکەون، و ئەگەر تەلاقەکەش (ڕیجعی) بوو، دوای هاتنەوەی ئەو شتەی کە هەڵواسینەکەی لە سەر کراوە، دەکەوێت، کە ئەمەیش، یەکێکە لەو دوو ڕیوایەتەی، کە لە (پێشەوا ئەحمەد)ـەوە، گێڕدراوەتەوە، و ڕووی ئەم قسەیەش وایە، کە ئەگەر تەلاقەکان (هەرسێکیان) پێکەوە بوون، واتە، "سێ تەلاقە"، بوو، ئیتر سەرجێیی لەگەڵ کردنی لەوە، و بە دوا دروست نییە، و بەلام ئەگەر تەلاقەکە (ڕیجعی) بوو، ئەو جۆرە کارانە، دروستن، چونکە هەرگیز شتی (ئیستا) ناکرێت، بە (کات بۆ دیاریکراو، و دواخراو!)، و (پێشەوا ئیبنوقەیم)یش، دەڵێت، ئەم ڕایە، لە ڕای دووەم ژیرانەترە.[2]

**ڕای چوارەم: پیاو دەتوانێت، زۆر بە ڕەهایی، و ئازادانە، دەستەواژەی (تەلاق)، لە ڕووی (هەڵپەساردن – التّعليق)، و (کۆتایی پێهێنان – التّنجيز)، هەڵبژێرێت، و بۆیە تەلاقی هەڵواسراو بە (مەرج)، و یان هەڵواسراو بە (کات)ێکەوە، دوای هاتنەدی، ئەو شتەی کە هەڵواسینەکەی لە سەر کراوە، ئیتر دەکەوێت، و ئەمەیش**

---

[1] باشتر وابوو، ڕای سێیەم دوا بخرێت، بەلام، لە بەر کورتییەکەی پێشمان خست.

[2] اغاثة اللهفان، ٢/١٩٣.

مەزهـەبی، (حەنەفــی)، و (شـافیعی)، و ڕای (جـەماوەری زانایـانی حەنبەلییەکانە)، لەگەڵ، (زەیدییەکان).

## * حەنەفییەکان :

لە پەڕتووکی (جوهرە)[1]دا، هاتووە، ئەگەر دایەپاڵ مەرجێك، ئەوا کـەمێك لە دوای مـەرجەکە دەکەوێت، وەك ئەوەی بڵێـت، (ئەگـەر چـویتە ماڵەکـە، تەلاقت کەوتبـێ)، ئەمەیش بە یەك دەنگی زانایـان، چـونکە لـەو کاتـەدا ماڵەکە هەر ماوە، و بە ڕوکەشـیش ئـەو مانەوەیـە، تـا کـاتی بـەرپابوونی مەرجەکە، هەر بەردەوام دەبێت، و هەروەها چونکە ئەگەر لە سەر مــەرجێك هەڵواسینەکە کرا، ئەوا لە کاتی هاتنە دی ئەو مەرجەدا، وەك ئەوە وایە، کە لەو کاتەدا، تەلاقی دابێت.

## * شافیعییەکان:

لە (مُهَذَّب)[2]دا، هاتووە، کە ئەگەر تەلاق هەڵواسرا، بە مەرجێك، کە بـۆی هەبوو، بێتە دی، وەك چوونە ناو ماڵ، و هاتنی سەری مـانگ، ئـەوا ئەگـەر مەرجەکە هاتە دی، تەلاقەکە دەکـەوێت، و ئەگـەر مەرجەکـە نەهاتـە دی، ناکەوێت، و لە پێغەمبەریشەوە (صلى الله عليه وسلم) هاتووە، کە دەفەرموێت، (الـمُؤْمِنُونَ عِنْدَ شُرُوطِهِمْ: مسوڵمانان دەبێت، پابەندی مەرجەکانیان بن).

---

[1] الجوهرة النيرة ٢/١١٠، الـمَبسوط، للسرخسـي ٦/١٠١، رد الـمحتار، علـى الـدر المختار، شرح تنوير الابصار ٣/٢٤١، و دواتر.

[2] المهذب ٢/٩٣، الأنوار ٢/٢١١، حاشية الباجوري ٢/ ١٤٧، و دواتر.

## * حەنبەلییەکان:

لە (مغني)دا[1]، هاتووە، کە ئەگەر تەڵاق لە (کات)ێکدا، کەوت، یان هەڵواسرا، بە صیفەتێکەوە، کە پەیوەست بێت پێوەی، ئەوا ئەو تەڵاقە ناکەوێت، تا ئەو صیفەتە، یان ئەو (کات)ـە، دێتە دی، بەڵام (اِبن قُدامَـة)، ڕەخنەی هەبووە، لێرەدا، بەوەی کە سڕینەوەی موڵکایەتی دروستە هەڵبواسرێت بە (صیفەت)، و بۆیە ئەگەر هەرکەس هەڵواسینەکەی بە (صیفەت) بوو، ئەوا پێش هاتنە دی ئەو صیفەتە نەبێت، ناکەوێت.

## * زەیدییەکان:

ئەمان دەڵێن، تەڵاقێك کە مەرجی تێدا گیرا بێت، کەوتنی بەستراوە، بە هاتنە دی مەرجەکەوە، و ناکەوێت، تا هاتنەدی، یان نەهاتنەدی ئەو مەرجە، حاسڵ نەبێت، و هەرچەندە ئەو مەرجەیش بۆی هەبێت، قەت نەیەتەدی، و (مُستَحِیل) بێت، بەڵام ئەوەیش هەیە، کە ئەگەر هەڵواسینەکە بە شتێکەوە بوو، کە دەبوو بێتە دی، وەك هەڵهاتنی خۆر، بۆیە ئەگەر هەڵیواسی بە شتێکی (نابەدیهاتوو: نەفی)یەوە، وەك: (ئەگەر خۆر هەڵنەهات، تەڵاقت کەوتبێت)، ئەوە ناکەوێت، و هەروەها ئەگەر هەڵیپەسارد، بە ڕابردووەوە، وەك، (ئەگەر زەید هات، "لە ڕابردوودا"، تەڵاقت کەوتبێت، هاتبوویش!!)، چونکە ئەمە لە دەستەواژەی ( دوێنێ ئێوارە تەڵاقت کەوتبێت!) دەچێت، کە ئەویش لە لایان بەتاڵە، و ئەگەر هەڵیپەسارد، بە شتێکی بەدی هاتووەوە، وەك، (ئەگەر خۆر هەڵهات، تەڵاقت کەوتبێت)، ئەوە ناکەوێت، تا ئەو مەرجە نەیەتەدی، و ئەگەر هەڵیپەسارد، بە شتێکی وا کە دەبوو، بێتەدی،(مُمکِـن)، و (بەدی نەهاتووەوە: مُسْتَحِیل)، ئەوا هەر هیچی

[1] المغني و الشرح الكبير، ٣١٨/٨.

ناکەوێت.[1]

## مەرجەکانی هەڵپەساردن، لە لای ئەوانەی کە پێیان وایە، تەلاّقی هەڵپەسێردراو دەکەوێت:

١. دەبێت ئەوەی تەلاّقەکەی لە سەر هەڵپەسێردراوە، (مُعَلّقٌ عَلَيْهِ)، لە کاتی دەربڕین و ڕانانی دەستەواژەکەدا بوونی نەبێت، و نەهاتبێتەدی، و نابێت ئەو هەڵواسراوانە ڕەمزی، و ڕووکەش بن، و تەلاّقەکەیش نابێت، (کۆتاییپێهێنەر- الـمُنجز)، بێت.

٢. دەبێت هاوسەرایەتییەکە، لە ڕاستییدا پێکهێنرابێت، و لە کاتی ڕوودانی هەڵپەساردنەکەدا، حوکم و بڕیاری لە سەر درابێت، دەنا مەرجەکە و شوێنەوارەکانی بەتاڵ دەبنەوە.

٣. دەبێت هەڵپەساردنەکە، لە سەر شتێك بێت، بۆی هەبێت، ڕوو بدات، و ئەگەر نەدەگونجا، ڕوو بدات، و (مُستَحِيل) بوو، ئەوا ئەم ڕوونکردنەوەیەی لای خوارەوەی پێویست دەبێت:

أ . (حەنەفییەکان)، دەڵێن: هەڵپەساردن بە شتێکی ناقۆلاّوە، (التَعليقُ بِالْمُستَحِيل)، هیچ بڕیارێکی لە سەر بنیات نانرێت، و تەلاّقی پێ ناکەوێت، لە کتێبی (الدرّ المختار)[2]دا، هاتووە: مەرجی دروستیی هەڵواسین لە تەلاّقدا، ئەوەیە کە مەرجەکە نەبێتە هۆکار بۆ ترسناکی هاتنە بوون، بۆیە شتی بەدیهاتوو، وەك: (ئەگەر ئاسمان لە سەرەوە بوو!)، ئەمە (کۆتاییپێهێنەر- الـمُنجز)ـە، و هەڵواسین بە شتی ناقۆلاّش (مُستَحِيل)، وەك،(ئەگەر حوشتر چوو، بە کونی دەرزی)دا، ئەمەیش بەتاڵە، و کار پێ نەکراوە، و سەرەڕای ئەمەیش جیاوازییان نەکردووە، لە نێوان (ناقۆلاّ:

---

[1] التاج المذهب، ٢/١٣٠.

[2] حاشية الطحاوي، على الدرّ الـمُختار، ٢/١٥٠.

مُسْتَحِيل)، لە ڕابردوو، و لە داهاتوودا.

ب . (مالیکییەکان)، دەڵێن: ئەگەر بەستییەوە بە داهاتوویەکی (ناقۆڵا: مُسْتَحِيل)ـەوە، ئەوە ناکەوێت، و بەڵام ئەگەر بەستییەوە، بە موستەحیلێکی ڕابردووەوە، دەسبەجێ دەکەوێت!، وەك ڕابوورد.

ج . (شافیعییەکان)، دەڵێن: ئەگەر تەڵاقەکەی هەڵپەسارد، بە (ناقۆڵا: مُسْتَحِيل)ـێکەوە، بەڵام لە ڕووی (جێگیرکردن - إِثْبَاتَ)ـەوە، بوو، ئەوە ناکەوێت، بەڵام ئەگەر لە ڕووی (ناجێگیرکردن - نَفِي)ـیەوە بێت، هەر لەو کاتەدا ڕاستەوخۆ دەکەوێت، هەروەك لە کتێبی (نِهَايَةُ الْـمُحْتَاج)[1]دا، هاتووە، و ئەگەر تەڵاقەکەی هەڵواسی، بە شتێکی وا، کە لە ڕووی عەقڵ، و شەرع، و عادەتەوە، ناقۆڵا، و موستەحیل بێت، ئەوا لەو کاتەدا ناکەوێت، و (الـمَغربي)[2] ئەوەی لە سەر گوتووە، کە لە کاتی (جێگیرکردن - إِثْبَاتَ)دا، یەکسەر دەکەوێت، و بەڵام لە کاتی هەڵواسینی تەڵاق، بە (نەفی کردنی "ئەنجامدانی"، کارێکی گونجاو)، وەك ئەوەی بڵێت، (ئەگەر نەچیتە ئەو ماڵە، تەڵاقت کەوتبێت)، ئەوا لە مەزهەبی (ئیمامی شافیعی)دا، ناکەوێت، مەگەر کاتێك کە نائومێد، و بێ هیوا ببێت، لە چوونە ناو ئەو ماڵەوە.[3]

د. پێشتریش ڕابورد، کە (زەیدییەکان)، گوتوویانە، لە شتی بە

---

[1] نِهَايَةُ الْـمُحْتَاج ٧/ ٤١، و حاشية الباجوري، ٢/ ١٤٨، (ئەگەر هەڵواسرا، بە موستەحیلێکەوە، لە ڕووی (إِثْبَات)ـەوە، ناکەوێت، بە پێچەوانەی (نَفِي)ییەوە، وەك ئەوەی بڵێت، "ئەگەر سەرنەکەوی بۆ ئاسمان، تەلاقت کەوتبێت"، ئەوە یەکسەر لەو کاتەدا، تەلاقەکە دەکەوێت).

[2] حاشية الـمَغربي على نهاية المحتاج، ٧/ ٤٥.

[3] مُغْنِيُ الـمُحْتَاج، ٣/ ٣١٨.

(مەرجگیراو)دا، تا (مەرج)ەکە، نەیەتەدی ناکەوێت، و ئیتر مەرجەکە (جێگیرکردن - إثباتَ)بێت، یان (ناجێگیرکردن - نَفي)، چوونیەکە، ئیتر هەرچەندە ئەو مەرجەیش (ناقۆلا: مُستَحِیل)، بێت.[1]

هـ. (ئیباضیەکان)، گوتوویانە: تەلاقی هەڵپەسێردراو، بە شتێکی (مُستَحیل)، ڕاستەوخۆ، و دەسبەجێ، دەکەوێت![2]

بەلام ئەمانیش لەوەدا جیاوازییان کەوتووەتە نێوان، کە ئایا ئەو کابرایەی، کە تەلاقی هەڵپەسێردراو، بە "مەرج"ی، خستووە، لە هەمان ئەو حاڵەتەدا، بە (تەلاقدەر)، دەهێنرێتە ئەژمار؟، و ئیدی هاتنەدی مەرجەکە، بۆ جێبەجێکردنی تەلاقەکەیە؟، و یاخود بە هاتنەدی مەرجەکە، جا بە (تەلاقدەر)، هەژمار دەکرێت؟ جا لە سەر ڕای یەکەم هۆکارەکە پێش دەکەوێت، و مەرجەکە و شوێنەوارەکەی، دوا دەکەون، و لە سەر ڕای دووەم، هۆکارەکە بە گریمانەیی دوا دەکەوێت، تا کاتی دێت، و ڕوونکردنەوەی ئەم قسانە بەم جۆرەیە، "ئەگەر پیاو بە ژنەکەی گوت، ئەگەر قسەت لە گەڵ فلانە کەس کرد، تەلاقت کەوتبێ!، قسەی ئەو پیاوە، (تەلاقت کەوتبێ)، هۆکارە بۆ کەوتنی تەلاقەکە، و قسەکەی تر، (ئەگەر لەگەڵ فلانە کەس قسەت کرد)، مەرجە بۆ کەوتنەکە، جا لە سەر سروشتی ئەم مەرجەیش، ڕا جیاییان هەیە، کە ئایا ئەم مەرجە بۆ هۆکارەکەیە، یان مەرجە بۆ شوێنەوارەکەی؟، و هەندێ لە شەرعزانانی، وەك، (حەنەفییەکان)، دەڵێن، هۆکار هیچ ڕۆڵێکی نییە، تا مەرجەکە دێتە دی، و هەندێکیش، وەك، (شافیعییەکان)، دەڵێن، هۆکارەکە پێش مەرجەکە هەبووە، بەلام شوێنەوارەکەی وەستاوە، لە سەر هاتنە دی مەرجەکە".

---

[1] التاجُ المَذْهَب، ٢/ ١٣٠.

[2] جَوْهَرُالنظام، ٢/٢٢١.

من وای دەبینم، کە ئەم ڕا جیایە[1] ڕووکەشییە، چونکە ئەگەر مەبەست پێی هۆکاری تەواو (العِلّة التّامّة) بێت، واتە، ئەو هۆکارەی کە مەرجەکانی هاتوونەتە دی، و ڕێگرەکان لاچوون، و ئەمەیش پێش هاتنەدی مەرجەکە، بە کۆدەنگی زانایان، بوونی نەبووە، و ئەگەر مەبەست پێی هۆکاری ناتەواو، (العِلّة النّاقِصَة) بێت، ئەوە بە بێ چەندو چوون، پێش مەرجەکە هەبووە، چونکە دەستەواژەی (دیسان)ـەوە، لە لای زۆرینەی خەڵك، لە دوای هاتنەدی مەرجەکان ناوترێتەوە، و دووبارە ناکرێتەوە.

## ـ تاووتوێکردنی بەڵگەی ئەم ڕایانە:

١. دەکرێت ئەم ڕەخنەیە ئاڕاستەی ڕای (ظاهرية)کان، بکرێت، کە تەنها ڕووکەشی قورئان و سوننەت سەرچاوەی فیقهی ئیسلامی نین، و بەڵکو لێرەدا سەرچاوەی ناوەنجی تر هەن، کە لە دوای قورئان و فەرمووده دێن، وەك، (کۆڕا - اِجْماع)، و (بە بەرداگرتن - قِیاس)، و (نەریت - عُرْف)، و (بەرژەوەندییە ڕەهاکان - مەصالیحی مورسەلە)، و (ڕێگرتن لە حەرام - سەدی زەرائیع)، و (فەرمایشتی هاوەڵان ـ ﭫ) ... ئینجا هەروەك چۆن هیچ دەقێك لە قورئان و سوننەتدا نەهاتووە، کە ببێتە بەڵگە لە سەر دروستی (التَعلِیق: هەڵپەساردن)، هەروا بەم شێوازەیش هیچ دەقێك نەهاتووە، کە نادروستییەکەی بسەلمێنێت، و تەنها ئەوەندە هەیە، کە دەتوانرێت بگوترێت، کە ڕای ئەوان لە سەر ئەو ئەسڵە بنیات نراوە، لەبەر ئەوەی کە دەقی شەرعیی لە سەر نییە، بۆیە ئەم هەڵپەساردنە دروست نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەبوونی زانیاری سەبارەت بەو بەڵگە و دەقە شەرعییە، خۆی لە خۆیدا، نابێتە بەڵگە لە سەر ئەوەی کە ئیتر زانیاری لەو بارەیەوە، بە دەستەوە نەبێت!

---

[1] اغاثة اللهفان، ١/١٩٣.

٢. دەکرێت بە (جەعفەرییەکان) بگوترێت، کە (تەڵاق)، بە بوونی سەرجەم پاشکۆ گەلی (شَرْطْ: مەرج)، و (جَزاءْ: پاداشت)، دەکەوێت، و ئەم شێوازەیش لە قورئانی پیرۆزدا، باسی هاتووە، کە دەفەرموێت: ﴿إِن يَنتَهُوا۟ يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ﴾،[1] و ﴿وَإِن جَنَحُوا۟ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا﴾[2]، نموونەی تر لەم بابەتەش زۆرن، لە قورئان و فەرموودەدا، و ئەوەی کە دەیڵێن: لە کاتی هاتنەدی مەرجەکەدا، لەفزی تەڵاقەکە نامێنێت، ئەوە دەگەیەنێت کە لە کاتی هاتنە دی مەرجەکەدا، ئیتر لە تەقدیردا لەفزی تەڵاقەکە بۆ کەوتن نوێ دەبێتەوە، هەروەك لە سەرجەمی (هەڵپەساردنەکان: "تَعلیق"ـەکان)ـدا، وایە[3].

٣. ئەو گوتەیەی (أشهب المالکی)، هاوڕێکی ئەو یاسایەیە کە دەڵێت: (القَصْدُ السَيئ يَرْجِعُ إِلـى أَهلِهِ)، واتە: نیازی خراپ دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی، هەروەها لە گەڵ لۆژیکی شەریعەتدا گونجاوە، بەڵام نابێتە بەڵگە لە سەر ئەوەی کە (تَعلیق: هەڵپەساردن)، هۆکار بێت، بۆ نەکەوتنی تەڵاقەکە.

٤. لە وەڵامی کۆمەڵی ڕای دووەمدا، دەکرێت بگوترێت: کە درووست نییە، حوکمی بەردەوامی شتێك، شەرعیەتی پێبدرێت، لە بەر ئەوەی کە لە سەرەتاوە شەرعی بووە، بە پێی ئەم یاسا گشتییەی کە دەڵێت: (يُغْتَفَرُ فِي

---

[1] الانفال: ٣٨، واتە: بڵێ بە کافرەکان، ئەگەر واز لە کوفر بهێنن، و مسوڵمان ببن، و پەیڕەویی لە پێغەمبەرﷺ، بکەن، ئەوا خوای گەورە، لە هەموو گوناهی لەوەو پێشیان ئەبووری!

[2] الانفال: ٦١، واتە: ئەگەر دوژمنەکان مەیلی ڕێکەوتن، و ئاشتییان کرد، تۆیش مەیلی بکە، و بچۆ بە دەمیانەوە، و ڕێکەوتن، و ئاشتییان لە گەڵدا بکە.

[3] البحر الزخار، ٣/ ١٩١.

البَقاءِ، مَا لا يُغْتَفَرُ فِي الإِبْتِداءِ)، واتە: ئەوەی لە سەرەتاوە نەدەبەخشرا، دوای بەردەوام بوون لە سەری، بەخشرا، و چاوپۆشی لە سەر کرا، چونکە فیقهی ئیسلامی لە زۆر جێگادا، لەم بارەیەوە جیاوازی لە نێوان ئەو دوو حاڵەتەدا کردووە، لەوانە:

- سەرەتای گرێبەستی هاوسەرگیری لە ئیحرامی حەجدا نادروستە، بەڵام دواتر و لە بەردەوامیدا وا نییە، و هەروەها سەرەتای گرێبەست، لە گەڵ ئافرەتێکدا، کە لە (عِدّة)دا، بێت، نادروستە، بەڵام دواتر، و لە بەردەوامیدا وا نییە، و دروستە.
- سەرەتای گرێبەست، لە گەڵ ئافرەتی زیناکاردا، لە لای (پێشەوا ئەحمەد)، و هاوڕاکانی نادروستە، و بەتاڵە، بەڵام دواتر، و لە بەردەوامیدا وا نییە.
- بەڵام ئەمە (قیاس) ناکرێت، لە سەر (داڕشتە: صِيغة)ـی، هاوسەرگیری کاتیی (النِكاح المُتْعَة)، چونکە ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە، بۆیە یاساغ کراوە، چونکە ئەسڵی گرێبەستەکە کاتییە، و ئەم گرێبەستە ڕەهایە، بەڵام شتێکی لێ پەیدا بووە، کە بەتاڵی کردووەتەوە، کە (کاتیی) بوونەکەیەتی، هەروەك چۆن ئەگەر تەڵاق مەرجێکی لە گەڵدا هەڵپەسێردرا، لەکاتێکدا کە دەیزانی ئافرەتەکە مەرجەکە جێبەجێ ناکات، بۆیە هەر ئەو مەرجە و هەڵپەساردنی کاری پێ دەکرێت، و بە (بەتاڵ)، نایەتە ئەژمار.

جا سەرەڕای سەرجەم ئەو ڕا و بەڵگە و تاوتوێکردنانەی ڕابوورد، گومانی زیاتر بە لای ئەوەدا دەڕوات، کە تا ئێستا هیچ شەرعزانێك نەگەیشتووە، بە بەڵگەی یەکلاکەرەوە (الدَلِيلُ القَطْعِي)، کە بیسەلمێنێت، هەڵپەساردنی تەڵاق دروستە، یان نادروستە، بەڵام ئەوەندە هەیە، کە ئەم پرسیارە، لە لای گشت کەسێك دروست دەبێت، کە لەم بوارەدا، سەرقاڵی لێکۆڵینەوە بێت، ئەویش ئەوەیە کە بۆچی گرێبەستی نیکاح، و مامەڵەی کڕین و فرۆشتن، و

هتد.... بە قسەی زارەکی و هەڵپەساردنی زارەکی هەڵدەوەشێنەوە، بەڵام لە تەلاقدا وا نییە، لە کاتێکدا کە پرۆسەیەکی ترسناك و بایەخدارە، لە ژیانی خێزانی و کۆمەڵگەدا، بۆیە چی بوویە فاکتەری ئەم حاڵەتە؟ دانیش بەوەدا دەنێم، کە پرسیارەکە، و ڕەخنەکە، لە جێگای خۆیدایە، و دروستە!

لەم بارەیەوە (إِبْنُ القَيِّم الجَوْزِي)،[1]، "ڕەحمەتی خوای لێ بێت"، دەفەرموێت: قسەمان دەربارە بە هەڵپەساردنی تەلاق، ڕێك وەك ڕا و قسەی ئێوە وایە، سەبارەت بە هەڵپەساردن لە ئازادکردن و بەخشین، و وەقف، و مامەڵە، و مارەبڕیندا، و بۆیە هەرگیز بۆتان ناکرێت، و دەست نادات، کە جیاوازی بکەن، لە نێوان ئەو شتەی کە هەڵپەساردنی دروستە، لە مامەڵە و گرێبەستەکانی بەخشین و ئاڵوگۆڕکردن، و لە کۆڵخستنەکان بە مەرج، لە گەڵ ئەو شتەی کە هەڵپەساردن تێیدا دروست نییە، بۆیە ئیتر قسەی بەرامبەر و دژە ئاراستەکانیان پووچ مەکەنەوە، دەربارە بە دروستبوونی هەڵپەساردنی تەلاق بە مەرجی شتێکەوە، بەس خۆ لێرەدا ئەوە بوونی هەیە، کە هەر خۆی بەڵگە، و دژکێوێنتە، لە سەر خۆتان، لە پووچەڵکردنەوەی قسەی خۆتان، سەبارەت بە قەدەغەکردنی دروستبوونی هەڵپەساردنی گەردن ئازادکردن، و بەخشین، و وەقف، و مارەبڕین، دەی باشە! کێ و چ لایەنێك بوو، ڕێگای نەدا، بە هەڵپەساردن لەمەدا، و کەچی لەویتریاندا هەڵپەساردنی بە دروست دانا؟!! جا ئەگەر بڵێین، هۆکاری جیاوازییەکەیان بریتییە لە، (لە جیاتی بوون، و بەرامبەر بوون: الـمُعاوَضَة)، و گوتتان: ئەو شتانەی کە بەرامبەریان هەیە، هەڵپەساردن بۆیان دروستە، بە پێچەوانەی ئەو شتانەی کە بەرامبەریان نییە، ئەوا ئەم ڕایەتان پووچەڵ دەبێتەوە، ڕاستەوخۆ بە گرێبەستێکی، وەك، گرێبەستی (الـجُعالَة: بە مەرجدانانی کرێیەك، لە بەرامبەر

---

[1] اعلام الـمُوقعين، ابن القيم الجوزي، ٤/ ١٠٢.

کارێك، و بە یەك لایەنەیش)، وەك گرێبەستی بەخشیـــن، و وەقـف، و ئینجـا ئەگـــەر جیاوازییەکـــەتان بـــە هـــۆی (مولکایـــەتی: التَمْلِیـــك)، و (لەکۆڵخستـــن:الإِسْـقاطْ) بـوو، و بلـێن: "گرێبەسـتی بـە مولـك کـردن هەڵپەساردنی تێدا ناکرێت، بە پێچـەوانەی گرێبەسـتی ئـەو شـتانەی کـە (الإِسْقاطْ: لەکۆڵخستـن)ـیان، تیادایە، ئەم قسەیەشـتان دیسـان پووچـەڵ دەبێتەوە، بە پرسێکی، وەك، (وەسیەتکردن)، و (گەردن ئازادکردن: الإِبْـراءْ)، و ئەگەر بلێن جیاوازی هەیە، لە نێوان بردنە نێو موڵك، و دەرکردن لە مولـك، و لە بردنە ناو مولکدا، هەڵپەساردن دروست نییە، و بە پێچەوانەوە، لە دووەمیاندا هەڵپەساردن دروستە، ئەم جیـاوازیی کردنەشـیان پووچـەڵە، و دانامـەزرێت، و هەڵدەوەشێتەوە، چونکە خۆ گـەردن ئـازادکردن، و بەخشیـــن، دەرکردنـی مـاڵ و سامانە، لە مولکی کەسەکە خۆی، و بـە ڕای ئێـوەش تیایانـدا هەڵپەسـاردن نادروستە، جا ئەگەر جیاوازیشتان کرد، بەوەی کە بلێن، هـەر شـتێك ئەگـەر مەترسی هەڵبگرێت، ئەوا تیایدا دروستە، و ئەگەر مەترسیش هەڵنەگرێت، ئـەوا تیایدا دروست نییە، وەك، (کڕین و فرۆشـتن)، و (مـارەبڕین)، و (بەکرێـدان)، و دیســان ئــەم قسەیەشــتان جـێگیر نابێـت، و هەڵدەوەشـێتەوە، بەگرێبەسـتی (بریکارێتـــی: وەکالـەت)، کـە هەڵپەسـاردن تیایـدا ناکرێـت، و چـاوەڕوانی مەترسیشی تێدا دەکرێت!!

# بەشە باسی دووەم
# سوێند خواردن بە تەڵاق

پێشتریش باسمان کرد، کە جاری وا هەیە، هەڵپەساردنی تەڵاق بە (سوێند) دەبێت، و ڕوو دەدات، بەڵام ئەوەش هەیە، کە جیاوازی کردن لەم بارەیەوە، و جیاکردنەوەی ئەم دوو حاڵەتە، واتە، (هەڵپەساردن: التَعلِيق)، و (سوێندخواردن: الحِلْف)، پێویستی بە ووردەکاری هەیە، و زانینی ئەو جیاوازییە، بە هۆی مەبەست (قَصْدْ)، و نیاز و سروشتی شتە هەڵپەسێردراوەکەوە دەبێت، بەڵام ئەگەر بۆ نموونە، کاتێك پیاوەکە دەستەواژەی ئاسایی سوێندخواردنی بەکارهێنا، وەك ئەوەی کە بڵێت، (بِالطَلاقِ أَفْعَلُ كَذا: بە تەڵاقم، فلاَن کار دەکەم)، و یان، (بِالطَلاقِ لا أَفْعَلُ كَذا: بە تەڵاقم، فلاَنە کار ناکەم)، ئیتر ئەم تێکەڵبوونەی نێوان (هەڵپەساردن: التَعلِيق)، و (سوێندخواردن: الحِلْف)ـە، ڕوو نادات.

## حوکمی سوێند خواردن بە تەڵاق:

لە سەر ئەم پرسە، ڕاجیایی هەیە، لە نێوان زانایانی پێشین و پاشین (السَلَفْ، وَالْخَلَفْ)، و لەم بارەیەوە سێ ڕایان هەیە[1]:

**ڕای یەکەم: ئەگەر سوێندەکەی کەوت، تەڵاقەکەشی دەکەوێت:**

ئەم ڕایە، ڕای بڵاوو ناسراوی جەماوەری شەرعزانە (حەنەفی)،[2] و (مالیکی)،[3] و (شافیعی)،[1] و هەندێ لە (حەنبەلییەکان)ـە،[2] و لە

---

[1] مجموع فتاوى ابن تيمية، ٣٢/٢١٥.

[2] حاشية الطحاوي، ٢/١٥٠.

[3] شرح الخرشي، ٤/٥٤.

گەلێ (زەیدییەکان)یش،[3] و تەنانەت هەندێ لە زانایانی ئەم (دواییە: الـمُتَأَخِرِين)، ڕایان وایە کە بە، (کۆڕا: الإِجْماع)، ئەو تەلاقە دەکەوێت،[4] و بەڵگەیان ئەوەیە کە پیاوەکە مەرجێکی لە سەر چەسپاوە، و دەبێت پابەند بێت پێوەی، و لە کاتی هاتنە دی مەرجەکەدا، دەبێت پابەند بێت، بەوەوە کە گوتوویەتی.

## دەکرێت ئەم ڕایە، لە چەند ڕوویەکەوە تاووتوێ بکرێت:

١. نە بە دەقی قورئان، و نە بە ئیجماع، ئەو ڕایە جێگیر نەبووە.

٢. سوێندخواردن بە غەیری خوا، و سیفاتەکانی بەتاڵە، و ئەوەی لە سەر شتی بەتاڵ بنیات بنرێت، ئەویش بەتاڵە[5].

---

[1] نهاية المحتاج ٧/٣٨، مغني المحتاج ٣/ ٣١٢.

[2] الروض المربع، ٣/١٧١.

[3] التاج المذهب و سەرچاوەی پێشوو، ٢/ ١٥٨.

[4] مَجْموُع فَتاوى، لِشَيْخِ الأِسْلام، اِبْنُ تَيْمِيَة، و سەرچاوەی پێشوو، ٢٣/٢١٦.

[5] بە شێوەیەکی بەربڵاو ئەم گێڕانەوە مێژووییە هەیە، کە دەگێڕنەوە، کابرایەك لە خزمەت خواناس و موتەصەویفی مەزن، (شێخ عومەری ضیائەددین)دا، " ڕەحمەتی خوای لێ بێت"، و لە کاتی قسەکردندا، لە دەمی دەردەچێت، و لە بڕگەیەکی قسەکانیدا دەڵێت، ( قوربان! بە سەری جەنابت! !)، شێخی ضیائەددینیش، " ڕەحمەتی خوای لێ بێت"، بەم سوێندخواردنە، بەتاڵە، بە غەیری خوا، و سیفاتەکانی، زۆر تێك دەچێت، و دەڵێت، بە کابرا، ئاخر سەری من چییە، تا تۆ سوێندی پێ دەخۆیت؟! ! دەی سوێند بە خوا، تا نەیەیت، و تف نەکەیت، لەو سەرەم، کە تۆ سوێندت پێ خوارد، وازت لێ ناهێنم، و ئەمەیش بۆ کابرا، زۆر سەخت دەبێت، کە کارێکی لەم جۆرە، و لە خزمەت خواناسێکی گەورەی وەك "شێخی ضیائەددین"دا، ئەنجام بدات، بەڵام هەر

٣. هەرکات تەڵاق کرا، بە جێگای نیاز، و وەك (سوێند)، بەکار هێنرا، بۆ سەرپێچی خوای گەورە، و بێ باوەڕی کردن، ئەمە کارێکی ناشایستە، و ناتەواوە، بۆ نموونە، کەسێك لە سەر خۆیی نەزر کردبێت، کە خۆی بێ باوەڕ بکات، ئایا لە سەری پێویستە کە ئەم کارە ناشایستەیە بکات؟!!، بێگومان، نەخێر ...، دەی کەواتە دواجار ئەم ڕایە بەم هۆیەوە، هەڵدەوەشێتەوە.

## ڕای دووەم: سوێند خواردن بە تەڵاق ناکەوێت، و کەفارەتیشی لە سەر نییە:

ئەم ڕایەش لە پێشەوا (عەلی کوڕی ئەبوطالیب)، " ڕەزای خوای لێ بێت"، و (قاضي شوڕەیح)، و (طاوُس)، و (عِكْرِمَة)، و خزمەتکارەکەی ئیبن عەبباس، و مەزهەبی (جەعفەرییەکان)، و (ظاهیری)، و (إباضِية)کان، گێڕدراوەتەوە.

## * جەعفەرییەکان:

دەڵێن: ئەو تەڵاقەی کە مەرجی پێوە هەڵپەسێردراوە، و یان وەك، (سوێند)، بەکارهێنراوە، ناکەوێت، هەروەك لە (جعفر بن محمد) گێڕدراوەتەوە، کە گوتوویەتی: ئەوەی سوێندی بە تەڵاق، یان بە (بەندە ئازادکردن)، خوارد، و پاشان سوێندەکەی کەوت، ئەوە هیچی لە سەر نییە، کەواتە تەڵاقی ژنەکەی لێ ناکەوێت، و (بەندە ئازادکردن)ـی، لە سەر نییە، چونکە پێغەمبەر (صلی

---

شێخی ضیائەددین،" ڕەحمەتی خوای لێ بێت"، لە سەر بڕیارەکەی بەردەوام دەبێت، و تف لێکردنەکەی پێ ئەنجام دەدات، کە ئەمە گەورەترین وانەیە، کە ئەم شێخ و خواناسە کەم وێنەیە، بە کردەوە فێری مسوڵمانانی کردووە، تا کەس سوێندخواردن، بە غەیری خوا، و سیفاتەکانی، بە دەمیدا نەیەت! (وەرگێڕ)

الله علیه وسلم)، ڕێگری کردووە، لە سوێندخواردن بە غەیری پەروەردگار، و هەروەها ڕێگری کردووە، لە تەلاٌق خستن، لە کاتی سوننەتی خۆیدا نەبێت.[1]

## * ظاهیرییەکان:

ئەمان دەڵێن: سوێندخواردن بە تەلاٌق، ئیتر سوێندەکە بکەوێت یان نا... تەلاٌقی پێ ناکەوێت، تەلاٌق ئەو تەلاٌقەیە، کە خوای گەورە، فەرمانی پێ کردبێت، و سوێند، ئەو سوێندەیە، کە خوای گەورە، لە سەر زمانی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێدابێت، و جگە لەمانە، شتی تر هیچ نییە، و بەڵگەیش ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە دەفەرموێت: (ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيۡمَٰنِكُمۡ إِذَا حَلَفۡتُمۡۚ)،[2] و هەروەها دەقی فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه

---

[1] مستدرك الوسائل، ٣/٦.

[2] ﴿ لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغۡوِ فِيٓ أَيۡمَٰنِكُمۡ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلۡأَيۡمَٰنَۖ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطۡعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنۡ أَوۡسَطِ مَا تُطۡعِمُونَ أَهۡلِيكُمۡ أَوۡ كِسۡوَتُهُمۡ أَوۡ تَحۡرِيرُ رَقَبَةٖۖ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٖۚ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيۡمَٰنِكُمۡ إِذَا حَلَفۡتُمۡۚ وَٱحۡفَظُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾ سورة المائدة: ٨٩، واتە: خودا لێتان ناگرێ لەسەر ئەو سوێندانەی بە بێ قەصدو نییەت دێن بە دەمتاندا، وەك لە وەلاٌمدا ئەڵێن: بەڵێ بە خودا، نە بە خودا، ئەو جۆرە سوێنانە قەصدیان لەگەڵ نییەو هەروەها بە فێربوون بە دەمتاندا دێن، خودا لەسەر ئەو سوێنانە لێتان ئەگرێ کە لەگەڵ وتنیاندا قەصدتان هەبێ و بەڕاستی سوێند بخۆن لەسەر کردن یا نەکردنی شتێ، بەڵێ لەم جۆرە سوێنانەدا ئەگەر شکاندتانن، ئەوا پێویستە کەفارەت بدەن، کەفارەتەکەش خواردەمەنی دانە بە هەژار لە مام ناوەندیی ئەو جۆرەخواردەمەنییانەی ئەیدەن بە خێزانی خۆتان، یا پۆشاك

وسلم) کە دەفەرمویێت: (مَنْ كانَ حالِفاً، فَلْيَحْلِفْ بِاللهِ)[1]، ئەوەی سوێندی خوارد، با سوێند بە خوای گەورە، بخوات، و لە ژێر رۆشنایی ئەم رایەدا، سەرجەم ئەو سوێندانەی کە بە غەیری خودا بخورێن، تاوانن، و بە سوێند نایەنە ئەژمار.(٢)

## * ئیباضییەکان:

دەڵێن: سوێندخواردن بە تەلاّق تاوانە، و دەربڕینی ئەوەی کە گوایە، ئەگەر ئەو شتەی سوێندی بە تەلاّق پێ خورا، نەهاتە دی، تەلاّقەکە دەکەوێت، ئەمە قسەیەکی داهێنراوە، و بیدعەیەکی خراپە، وەك لە کتێبی (جوهر النظام)دا، هاتووە، کە دەڵێت:

وَحلف الطلاق نوع معصية فاعله ليس لَهُ مِنْ تَزْكِيَة

لأنه بِغَيْرِ رَبِّيَّ أَقْسَما فَهُوَ بغير ربع عَظما

وَالحلف في طلاقها إن حنثا والقول بالطلاق مِمّا أحدثا[3]

---

کردن بۆ دە هەژار، یا ئازادکردنی بەندە بێ، جا ئەگەر ئەمانە هیچ کامتان نەبوو ئەوا ئەبێ سێ رۆژ بە رۆژوو بن ، ئەمەیە کەفارەتی سوێندی راستەقینەتان ئەگەر شکاندتان و نەتانبردەسەر، خۆتان راگرن لە شکاندنی سوێندەکانتان، مەگەر شکاندنەکە خێرێکی تێدا بێ ، خودا ئا بەم جۆرە ئایەتو حوکمەکانی ئاینتان بۆ رۆشن ئەکاتەوە، بەڵکو بەجێیان بهێننو شوکرانە بژێری خودا بن لەسەر ئەم هیدایەتە.

[1] البخاري، ٢٤٨٤

[2] المحلى، لابن حزم الظاهري، ١٠/ ٢١١ ـ ٢١٢.

[3] جوهر النظام، ٢/ ٢٢٢

ئەم ڕایەش لە لایەن (الشیخ محمد شلتوت)، (شێخی پێشووی زانکۆی ئەزهەر)، پشت ڕاست کراوەتەوە، و دەڵێت: (ئەو کەسەی سوێندی بە تەڵاق خوارد، پێی کافر نابێت، گوایە لە بەر ئەوەی کە فەرموودەکە دەفەرموێت (مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللهِ فَقَدْ كَفَر: ئەوەی سوێندی بە غەیری خوای گەورە، خوارد، کافر بووە!)، چونکە ئەم فەرموودەیە، مەبەستی ئەوەیە کە ئەوەی سوێندی بە غەیری خوا خوارد، زۆر تاوانبارە، و ڕۆچووە لە گوناهدا، و ئەو سەردەمەیش سەردەمی بە مەزن ڕاگرتنی خودا دەستکرد، و دروستکراوەکان بووە، بۆیە ئەو دەستەواژەیە بەکارهاتووە، و سوێندخواردن بە (تەڵاق)، مانای ئەو دروستکراو، و بە گەورە زانینانەی تێدا نییە، کە لەو سەردەمەدا باو بووە، و بەڵکو ئەم کارە تێکدانی ڕێڕەوی پرۆسەی سوێندخواردنە، و بەکارهێنانی سوێندە بۆ شتێك، کە خوا بۆ سوێند داینەناوە، و ئیتر ئەوەی سوێندی خوارد، با سوێند بە (خودا) بخوات، و یان بێدەنگ بێت، و ڕای دروستی زانایان، لە سەر ئەوەیە، کە سوێند خواردن، بە غەیری خوای گەورە، ئیتر بە پێغەمبەر، (صلى الله عليه وسلم)، بێت، یان بە فریشتەیەکی نزیك لە خوا، سەرجەمی حەرامە، و هیچی لە سەر دروست و پێك نایەت، و کەفارەتەکەیشی تەوبە، و پەشیمان بوونەوەیە، لە بەردەم زاتی پەروەردگاردا.[1]

---

[1] فتاوی الامام محمد شلتوت، ١/٣٠.

**ڕای سێیەم: ئەم (سوێند بە تەڵاق خواردن)ـە، وەك سوێندی تری مسوڵمانان وایە، لە کاتی کەوتنی سوێنددا، چ کەفارەتێك پێویستە، لەمیشدا پێویست دەبێت، تەنها کاتێك نەبێت، کە کابرای (سوێند خۆر)، مەبەستی بێت، تەڵاقەکەی بکەوێت، ئەو کاتە تەڵاقەکەی دەکەوێت، و ئیتر کەفارەتی لە سەر نییە.**

(شێخی ئیبن تەیمییە)،" ڕەحمەتی خوای لێ بێت"، دەڵێت[1]: ئەمە دروست ترینی قسەکانە لەم بارەیەوە، و ئەمەش کە قورئان و سوننەت و کۆمەڵێك لە زانایانی (پێشین، و پاشین: السَلَف، وَ الْخَلَف) پاڵپشتی دەکەن، و هەروەها ئەم ڕایە دەرهاویشتەی ئەوەیە، کە لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)، بە ئێمە گەیشتووە، و زۆرینەی (مالیکییەکان)، و هی تریش، بە گوێرەی ئەم ڕایە فەتوایان داوە.

**ئەوەی ڕای منە، و من بۆی دەچم:**

تەڵاق کە لە سەر شێوازی (سوێند)، بەکار هات، ناکەوێت، مەگەر ئەو تەڵاقە (کۆتایی پێهێنراو: الـمُنْجَز)بێت، و هەروەها تەڵاقی (مەرجدار)یش، هەر ناکەوێت، لە بەر ئەم فاکتەرانەی لای خوارەوە:

١. شەرعزانەکان هاوڕان، کە هەر هەڵسوکەوتێکی زارەکی، یان کرداری، کە مەرجی پێوە بەسترا، ئەوە بەتاڵە، و بڕیاردان لە سەر کەوتنی تەڵاقی هەڵواسراو، کاتێك کە هەڵپەساردنەکە هاتە دی، ئەمە پێچەوانەی ئەو کۆکبوونی زانایانەیە.

٢. تەڵاق ترسناکترین هەڵسوکەوتی زارەکییە، کە مرۆڤ پێی هەڵدەستێت، جا ئەگەر مامەڵە، یان دیاری ناردن، یان ئەم جۆرە شتانە بوو، کە مەرجی پێوە بەسترا، ئیتر بەتاڵە، جا گریمان تەڵاق مەرجێکی پێوە بەسترا، ئەوا بەتاڵ

---

[1] مجموعة الفتاوى، شيخ الاسلام، ابن تيمية، ٣٣ / ٢١٨ – ٢١٩.

بوونەوەی ئەم لە پێشترە، لەوانەی پێشوو، چونکە دزێوترین کرداری حەلاّلـە، لە لای خوای پەروەردگار، و لایەنە نێگەتیڤەکانی بەردەوام زیاترە، لە لایەنە پۆزەتیڤەکانی، لە سەر ژن، و پیاو، و منداڵەکانیان، وخەڵکانی تر.

٣. شەرعزانانی ئیسلام هاوڕا، و کۆکن، لە سەر ئەوەی کە سوێندخواردن بـە غەیری خوا، و سیفاتەکانی بەتاڵە، و ئەوەی لـە سـەر شـتی بـەتاڵ بنیـات بنرێت، ئەویش هـەر بەتاڵە، بۆیە ئەگەر کەسێك تەلاّقی خوارد، وەك سوێند، و سوێندەکەی کەوت، تەلاّقی پێ ناکەوێت.

٤. دەبێت شەریعەت لە سەرچـاوەیەکەوە وەربگیرێـت، نـەك لـە ئیجتیهـادی شەرعزانەکان، و هەر کات گەڕاینەوە بۆ سەرچاوەی شەریعەتی ئیسلام، ئەوا هەرگیز چاومان بە (تەلاّقی هەڵواسراو – الطَلاقُ الـمُـعَلّقْ)، و یان (سوێند خواردن بە تەلاّق – الْحِلْفُ بِالطَلاقُ)، ناکەوێت، نە لە قورئانی پیرۆزدا، و نە لە سوننەتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)، و نە لـە فـەتوا، و بڕیـار، و قەزاوەتی هاوەلاّندا،(رضي الله عنهم).

٥. هەڵپەساردنی تەلاّق، و سوێند پـێ خـواردنی، لـە سـەردەمی دەسـەلاّتی ئەمەوییەکاندا داهێنران، ئەوکاتانەی کە دەسەلاّتدارانی خیلافەتی ئەمەوی، ئۆپۆزسیۆنی سیاسی خیلافەتەکەیان، تۆمەتبار دەکرد، بەوەی کە پشـتیوانی لە (عەلەوییەکان)، دەکەن، بۆیە لە کاتی گیرانی هـەر تۆمـەتبارێکی ئـەم پرسە، لە بەر ئەوەی کە ئەو کاتە سزای زیندان، و ڕاگرتن، و ئەوانەی ئازادی بەرتەسك دەکەنەوە، هێشتا کاریان پێ نـەدەکرا، بۆیـە پـەنایان دەبـردە بـە سوێنددانیان بە قورئان، بەوەی کە خیانەتیان لێ نەکەن، و نەبنە پشتیوانی بەرهەڵستکارەکانیان، کەچی دواتر دەردەکەوت، کە سوێندەکانیان خستووە، و کاریان پێ نەکردووە، بۆیە دوای ئەمە پەنایان بردە بەر ڕێگا چارەیەکی تـر، کە ئەویش (تەلاّق پێ خستـن) بوو، بە (تـەلاّقی هەڵپەسـێردراو - الطَـلاقُ الـمُـعَلّقْ)، و یان (سوێند دانیان بە تـەلاّق– الْحِلْـفُ بِـالطَلاقُ)، و کـابرای

تۆمەتبار دەیگوت، ئەگەر هاوکاری ئۆپۆزسیۆن بکەم، تەڵاقی ژنەکەم کەوتبێ، یان دەیگوت، بە تەڵاقم خیانەتتان لێ ناکەم، و نابمە پشتیوانی بەرهەڵستکارەکانتان، جا ئەگەر کابرای تۆمەتبار لە مەیداندا درۆی لێ دەریکەوتایە، ئەوا بڕیاریان لە سەر دەدا، کە تەڵاقەکەی کەوتووە، و ئیتر نەیاندەهێشت، لە گەڵ ژنەکەیدا، بەردەوامی بە پرۆسەی هاوسەرگیری بدات، و لێرەوە دیاردەی (تەڵاقی هەڵپەسێردراو - الطَلاقُ المُعَلّقْ)، و (سوێندخواردن بە تەڵاق - الْحِلْفُ بِالطَلاقُ)، دەرکەوت، و دواتر ئەم پرۆسەیە بووە، جێگای ڕاجیایی شەرعزانان، و هەیانبوو فەتوای لە سەر ئەوە دەدا، کە (تەڵاقی هەڵپەسێردراو)، و (سوێند خواردن بە تەڵاق)، بەتاڵن، چونکە لە قورئان، و سوننەت، و فەتوای هاوەڵاندا، (رضي الله عنهم) نەهاتووە، و هەیانبوو ڕای وابوو، کە ئەگەر مەرجی هەڵپەساردنەکە هاتە دی، یان سوێندەکەی خست، ئیتر تەڵاقەکەیش دەکەوێت، و ئیتر لەو کاتەوە تا ئێستا، ئەم ڕاجیاییە، هەر بەردەوام بوو، و هەندێك پشتیگرییان لێکرد، و هەندێك دژی وەستانەوە، لە سەر بابەت و پرسێك، کە بە ڕاستی، لە شەریعەتی ئیسلامدا، هیچ بنەمایەکی نییە.

## هەڵپەساردنی تەڵاق، و سوێندخواردن پێی، لە یاساکانی باری کەسێتیدا، (الأحوال الشخصية):

- یاسای عێراقی مادەی (٣٦)، تەڵاق کە لە سەر شێوازی سوێند بەکارهات، ناکەوێت، مەگەر ئەو تەڵاقەی کە (کۆتایی پێهێنەر – المُنْجَزْ)، و یان (مەرجدار – المَشروطْ)، بێت.

- یاسای ئەردەنی ماددەی (٨٩)، تەڵاقێك کە (کۆتایی پێهێنەر – المُنْجَزْ)، نەبێت، کە بەکارهات، بە مەرجی کردنی، یان نەکردنی کارێك، ئەو تەڵاقە ناکەوێت.

ـ یاسای سوریا ماددەی (٩٠)، تەلاّقێك كە (كۆتایی پێهێنەر – الـمُنْجَزْ)، نەبێت، و مەبەست پێی كەوتن نەبێت، ئەگەر بەكار هات، بـۆ كـردن، یـان نەكردنی كارێك، و كەوت، تەلاّقەكە ناكەوێت، یاخود، وەك، "سوێند"، بەكار هات، تەنها بۆ پاڵپشتكردنی هەواڵێك، و هیچی تر، ئـەم تەلاّقـەیش هـــەر ناكەوێت.

ـ یاسای وڵاتی مەغریب، بەشی (٥٢)، (تـەلاّقی هەڵپەسـێردراو- الطَّـلاقُ الـمُـعَلّقْ)، لە سەر كردن، یان نەكردنی كارێك، ناكەوێت.

ـ یاسای وڵاتی تونس، بەشی (٣٠ ـ ٣١)، تەلاّق تەنها لای دادگا دەكەوێت، و بە داوای یەكێك لە ژن و پیاوەكە دەبێت، بكەوێت.

لــە ســۆنگەی ئـەم دەقانــەوە دەردەكــەوێت، كـە یاسـای (عێراقــی)، ڕای (جەعفەریی)، و (ظـاهیــری)، و هاوڕاكـانی وەرگرتــووە، و یاسـاكانی تــر سەبارەت بــە (تەلاّقی هەڵپەسێردراو)، و (تەلاّقی لە جیاتی سوێند خوراو)، لە سەر ڕای (شێخی ئیبن تەیـمییە)،" ڕەحمەتی خوای لێ بێـت"، و هاوڕاكـانی ڕۆیشتوون، و یاسای (وڵاتـی تـونس)یش، ئەگەرچـی بـە ڕاشـكاوی ئـەوەی نەدركاندووە، بەلاّم لێوەی دەفامرێتەوە، كە (دوو)، مــەرجی ڕواڵەتیـــی، بـۆ (تەلاّق)، داناوە، كە بریتیــن لە:

(١). بەرزكردنەوەی داوا، لە لایەن یەكێك لە ژن و پیاوەكەوە.

(٢).كەوتنی تەلاّق، لە بەردەم دادگادا.

## ﴿بەشی سێهەم﴾

## خستنی سێ تەڵاقە، تەنها یەك تەڵاقی پێ دەكەوێت

﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖ ﴾ سورة البقرة: ٢٢٩

واتە: تەڵاقێك كە بردنەوەی لە دواوە بێ، دوو جارە، و ئینجا دوای ئەوە ڕاگرتنە بە خۆشیی، و یان بەرەڵڵاكردنە بە باشیی.

## پێشەکی:

ئەم پەڕاوە گچکەیە، لەو پەڕتووکە فراوانە وەرگیراوە، کە تایبەت بە باسی (تەڵاق) نووسیومانە،[1] و هۆکارەکانی ئەم وەرگرتنەیش زۆرن، لەوانە:

١. بە هۆی ئەو تێکەڵی و پێکەڵییەی کە لە نێوان (شەریعەتی ئیسلامیی)، و (فیقهی ئیسلامیی)دا، هەیە، لە کارکردن بە بەرنامەی ئیسلامدا، بەرپا بووە، و مەزهەبەکان جێگای قورئان و سونەتیان گرتووەتەوە، کە ئەمەش هەڵەیەکی کوشندەیە، و لێبوردنی بۆ نییە، لە گەڵ بوونی ئەوپەڕی ڕێز و شکۆمەندیمان بۆ شەرعزانەکانمان، کە بەوپەڕی لێبڕاوانە و بە جوانترین شێوە، ئەرکی سەرشانی خۆیانیان جێبەجێ کردووە، و پابەندبوون بە قورئانی پیرۆز، و سوننەتی پێغەمبەر،( صلى الله عليه وسلم)، و فەتوا و بڕیارەکانی هاوەڵانەوە، (خوایان لێ ڕازی بێت)، ئەمان بە پێچەوانەی کەسانی دوای خۆیان، کاریان کرد، لەو پیاوە تابیینیانەی کە لە دوای وەستان، و داخستنی دەرگای ئیجتیهادکردن، تەواوی ژیانی خۆیان سەرقاڵ کرد، بە زانستەکانی (آلَـة: ئامراز)ـەوە، واتە، ئەو زانستانەی کە ئامرازن، بۆ تێگەیشتن لە قورئان و سوننەت، و دواجار خودی ئەو دووانەیان "واتە: قورئان و سوننەت"، لە یاد کرد!

٢. وابەستە بوون، بە مەزهەبێکی دیاری کراوەوە، کە ئەمەیش بە پێچەوانەی فەرمانی خوای پەروەردگارەوەیە، کە دەفەرموێت: ﴿فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن

---

[1] ئەم پەڕتووکە بەرفراوانە، بریتییە لە، (مدى سلطان الارادة في الطلاق، في الشرائع والقوانين والأعراف خلال أربعة آلاف سنة)، ل٢٣٧ ـ ٢٩٠.

﴿كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾﴾ ،[1] ئەمەیش بووە، هۆکاری مالّوێرانکردنی ملیۆنەها خێزان، و ئەمەیش لە سەر بناغەی ئەوەی کە دەربڕینی سێ تەلاٌقە، بە یەك لەفز، و بە یەکجار، هەرسێکی پێ دەکەوێت، و دەچێتە حالّەتی (بَيْنُونَة كُبْرى)، و هیچ جۆرە دەروازەیەك نامێنێتەوە، بۆ ئەوەی کە ئەو ژنە بچێتەوە بۆ لای مێردەکەی، مەگەر لە دوای شووکردن، بە کەسێکی تر، و سەرجێیی کردن، لە گەڵیدا، و دواتر جیابوونەوە، و عیددەی تەواو ببێت، ئینجا بگاتەوە، لای پیاوی یەکەمی.

٣. هەندێ لەوانەی کە ڕایان وایە، کە تەلاٌقی سێ بە سێ، بە یەکجار، هەرسێکی پێکەوە دەکەوێت، پەنایان بردووەتە بەر تاکتیکێکی شەرعی، ئەویش ئەوەیە کە وا بڕیار دەدەن، بە سەر ئەو گرێبەستە پێشووەدا، کە بەتاڵە، و هەڵوەشاوەیە، بە پێی ڕەوت و ڕەوگەی (ئیمامی شافیعی)، (خوا لێی ڕازی بێت)، هیچ بنەمایەکی نییە، و پوچ و دانەمەزراوە، بە بیانووی ئەوەی کە شایەتەکانی خراپەکار (فاسق) بوون، دواتر بە پێی ڕەوگەی (ئیمام ئەبوحەنیفە)، (خوا لێی ڕازی بێت)، دەست بە گرێبەستێکی تری هاوسەرێتی دەکەن، چونکە (ئیمام ئەبوحەنیفە)، (خوا لێی ڕازی بێت)، پێی وایە، کە بۆ دروستی گرێبەستی هاوسەرێتی، دادگەربوونی شایەتەکان بە مەرج نەگیراوە! ئەمە لە کاتێکدایە، کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام، چەرخی زێڕینی خۆی تێپەڕاند، کە زیاتر لە سەدە و نیوێك بوو، لەو سەردەم، و کاتەیشدا، مەزهەبێکی دیاریکراو، لە ئارادا نەبوو، تا مسوڵمانان پەیڕەوی لێوە بکەن، و پێوەی پابەند بن.

٤. هۆکارێکی تری سەر لە نوێ بلاٌوکردنەوەی ئەم باسە، و سەربەخۆکردنی لەم پەڕاوە گچکەیەدا، ئەوەیە کە لە دژی (تەلاقی سێ بە سێ)دا، هەڵە بە

---

[1] (النحل: ٤٣)، واتە: لەو شتانەیدا کە نایزانن، لە زانایان بپرسن.

هەڵە چارەسەر کراوە، کە هاتوون، بڕیاریان داوە، بە کەوتنی (تەڵاقی سێ بە سێ)، بە یەکجار، و پاشان پەنایان بردۆتە بەر ئەو پرۆسەیەی کە بە (التحليل: مارە بە جاش)، ناوزەد کراوە، کە ئەم مارەبەجاشەیش، بریتییە لەوەی کە ژنە تەڵاقدراوەکە، مارە بکرێت، لە کابرایەکی نەناسراو، و بۆ تاقە شەوێك، بە لایەوە بێت، و دواتر لە سەریەتی، پاش سەرجێیی کردن، لە گەڵیدا تەڵاقی بداتەوە، کە بێگومان پرۆسەیەکی لەم جۆرەیش کارێکی ناپەسەند، و ناشەرعییە، لە بەر (سێ) هۆکار:

- **هۆکاری یەکەم:** (مارە بە جاش)، هاوسەرگیرییەکی کاتییە، بۆیە پووچەڵ، و دانەمەزراوە.

- **هۆکاری دووەم:** پرۆسەیەکە، کە مەرجی تەڵاقدانەوەی ژنەکە، لە سەر کابرای دووەم، لە دوای سەرجێیی کردن، لە گەڵیدا، لە سەری دانراوە، دیسان ئەمەیش هەر بەتاڵ، و پوچەڵە.

- **هۆکاری سێیەم:** پایەی ڕازیبوونی هەردوولا، لەم گرێبەستە هاوسەرگیرییەدا، نەهاتۆتە دی، چونکە ئەو ژنە تەڵاقدراوە بەستەزمانە ڕازی نییە، کە ژنی ئەو کابرا نەناسراوە بێت، بە درێژایی ژیانی، و ئەو ژنە داماوە، لە ژێر فشار و ناچاریدا، بەم جۆرە پرۆسەی هاوسەرگیرییە ڕازی بووە.

## حوکمی ئەو دەستەواژەیەی کە (ژمارە)ـی، تەڵاقی تێدا دیاری کراوە:

قورئانی پیرۆز ئەوەی دیاری کردووە، کە تەڵاق، سێ دانە تەڵاقە، دابەشیش کراوە، بە سەر سێ کەرەتدا، و لە سێ کاتی جیاوازدا، کە دەفەرموێت: (ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ )[1]، جا قورئان ئەم

[1] ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَأۡخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَا فِيمَا ٱفۡتَدَتۡ بِهِۦۗ

**دابەشکردنەی داناوە، بە مەرجێکی تر، لە سەر ویستی پیاو، هەرکات ویستی بەرەو پرۆسەی تەلاقدان، هەنگاو هەلبگرێت، بەلام ئەی حوکم و بڕیار لێرەدا چی دەبێت، ئەگەر پیاوەکە پەلەی کرد، و هەر سێ تەلاقەکەی بە یەکجار دا، بۆ نموونە، گوتی: (أنتِ طالِقٌ ثلاثاً)، سێ تەلاقەت کەوتبێت، و یان وتی: (أنتِ طالِقٌ، وَ طالِقٌ، وَ طالِقٌ)، تەلاقت کەوتبێت، و تەلاقت کەوتبێت، و تەلاقت کەوتبێت، و یان گوتی: (أنتِ طالِقٌ، ثمَّ طالِقٌ، ثمَّ طالِقٌ)، تەلاقت کەوتبێت، پاشان تەلاقت کەوتبێت، پاشان تەلاقت کەوتبێت، و یان بلێت: (أنتِ طالِقٌ، أنتِ طالِقٌ، أنتِ طالِقٌ)، تەلاقت کەوتبێت، تەلاقت کەوتبێت، تەلاقت کەوتبێت، و یان بلێت: (أَنْتِ طالِقٌ عَشْرُ مَرّاتٍ)، دە جار تەلاقت کەوتبێت، یان بلێت: (أَنْتِ طالِقٌ مِائَة طَلْقَةٍ)، سەد تەلاقت کەوتبێت، یان نموونە گەلی تری دەستەواژەی لەم جۆرە.**

**جا هەر لە سەرەتای ئیسلامەوە، شەرعزانە مسولمانەکان، لە حوکمی ئەم پرسەدا، ڕاجیایی لە نێوانیاندا بەرپا بووە، و ئەم ڕاجیاییەش دۆزێکی درێژ و پان و پۆڕ و پەل و پۆدراە، قسە و ڕای زۆری لە سەر گوتراوە، و لە سەر گێڕدراوەتەوە، بەرفراوانە، و پەی بردن بەم باسە، و بە بەلگەکانی، و کۆنترۆلکردنی کاتێکی زۆر و ئینسکلۆپیدیایەکی مەزنی دەوێت، چونکە لە ڕاستییدا، ئەمە پرس و بابەتێك نییە، کە کەسە مێشك چەقبەستوو، و**

---

تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا ۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُولَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ ﴾، (البقـرة: ٢٢٩)، واتە: تەلاقێك کە بردنەوەی لە دواوەبێ، (دوو جارە)، ئینجا ڕاگرتنە بە خۆشیی یا بەرەڵلاکردنە بە باشیی، و دروست نییە، بۆ ئێوە هیچیان لێ بسەننەوە، لەو شتانەی کە داوتاننێ، مەگەر (هەردولا) بترسن (لەوەی) کە سنووری خوا ڕانەگرن، ئینجا ئەگەر ترسان لەوەی کە سنووری خوا ڕانەگرن، گوناهیان ناگات لەوەی کە ژنەکە لە بڕێتی خۆی بیدات، ئەمانەی باسکران، سنووری خوان لێیان دەرمەچن، و هەر کەسێك لە سنوورەکانی خوردا دەرچێ، ئەوانەن ستەکار!

لاساییکارەکان، توێژینەوەی لە سەر بکەن، ئەوانەی کە سەراپای هێزی تێکستە قورئانییەکان، دەبەخشنە گوتەی زانایان، تا ئەوان قسەی لە سەر بکەن، و توێژینەوەی دەربارە ئەنجام بدەن، و هەروەها ئەم باسە، باسی ئەو کەسە نوێخوازانەی سەردەم نییە، کە ئاسانکاری و چاوپۆشی ئیسلامەتی دەکەنە بیانوو، و پاساو، بۆ ئاسانکاری لە سەرجەمی پرسە بنەڕەتی و لاوەکییەکاندا، و بەڵکو ئەم پرسە پرسێکی ئەکادیمییە، و دەبێت توێژینەوەکردن تیایدا، لە بەر ڕۆشنایی دەقەکانی قورئانی پیرۆز، و سوننەتی پێغەمبەری دڵسۆزدا، (صلى الله عليه وسلم)، بێت، لە گەڵ پشت بەستن بە شوێنەواری هاوەڵانﷺ، و شوێنکەوتووانﷺ، و ڕای هەندێ لە شەرعزانەکانی ئەو مەزهەبە ئیسلامییانەی کە نووسراونەتەوە، و مەزهەبەکانیان دیار و ناسراون، بە بێ وابەستە بوون، و یاخود بوونی دەمارگیریی بۆ هیچ مەزهەبێکی دیاریی کراو.

## دەکرێت سەرجەمی ڕاجیاییەکان بگێڕینەوە بۆ ئەم چوار ڕایە:

(١). هەر تەلاّقێك کە بە (ژمارە) دیاری کرا، هیچ تەلاّقێکی پێ ناکەوێت، نە تەلاّقێك، و نە دوو تەلاّق، و نە سێ تەلاّق.

(٢). سەبارەت بەو ئافرەتەی کە گواستراوەتەوە، و سەرجێیی لە گەڵ کراوە، چەند تەلاّقی خستبێ، ئەوەندەی پێ دەکەون، و بۆ ئافرەتی سەرجێیی لە گەڵدا نەکراویش، تەنها یەك تەلاّقی پێ دەکەوێت.

(٣). کابرا چەند تەلاّقی خستبێ، ئەوەندەی پێ دەکەوێت، و ئیتر چونیەکە، ژنە مارە بڕاوەکە، گوازرابێتەوە، یان، نا...

(٤). چەند تەلاّقی خستبێ، تەنها یەك تەلاّقی پێ دەکەوێت، بە ڕەهایی.

جا خستنە بەرچاوی ئەم ڕایانە، و گفتوگۆکردن لە سەریان، و ڕوونکردنەوەی بەڵگەکانیان، و توێژینەوەیان، بە پێی ئەو ڕیزبەندییەی سەرەوە، لە چوار بەشە باسدا، دەخەینە ڕوو.

# بەشە باسی یەکەم
# ڕای ئەو زانایانەی کە دەربڕی ئەوەن کە هیچ تەڵاقێکی پێ ناکەوێت

ئەگەر پیاوەکـە هـەر سـێ تەڵاقەکـەی پێکـەوە کـۆکردەوە، و ژنەکـەی بـە هەرسێکیان تەڵاق دا، بە یەکجار، و پێکەوە، ئەمـە پێچـەوانەی فـەرمان و ڕەوش و پەیڕەوی قورئانی پیرۆز، و سوننەتەکانی پێغەمبەری دڵسۆزە، (صـلی الله علیه وسلم)، جا کاری لەم جۆرە، حوکمەکەی لە لای هەندێ لە شەرعزانان، بریتییە لەوەی کە هیچ تەڵاقێکی پێ ناکەوێت.

- لە پەڕتووکی (الرَّوْضَةُ البَهِيَّة)دا، هاتووە، کە دەبێژێت: ئەگەر تـەڵاق، بـە زیاتر لە دانەیەك، لێکدرایەوە، وەك ئەوەی کە گوتبێتی: (أنتِ طـالِقٌ ثلاثـاً: سێ تەڵاقەت کەوتبێت)، ئەوا ئەو لێکدانەوەیـە، و زیـادە گۆییـە، بـەتاڵ و پڕوپووچە، و تەنها یەك تەڵاقی پێ دەکەوێت، و هەروەها گوتراویشە، کە هەر سێ تەڵاقەکە، لەم کاتەدا پڕوپووچ و بەتاڵ و دانەمەزراون، چونکە داهێنراوە، و بیدعەیە، لە بەر ئەو فەرمایشتەی پێغەمبـەر، (صـلی الله علیـه وسـلم) کـە دەفەرموێت : (مَنْ طَلَّقَ ثلاثاً، فَلَيْسَ بِشَيْءٍ)، هەرکەسێك سێ تەڵاقە پێکەوە بخات، ئەوە هیچی لـە سـەر نییـە، و هـیچ تـەڵاقێکی پـێ ناکـەوێت، جـا هەرکەسـێك پێچـەوانەی قورئـانی پـیرۆز مامەڵـە بکـات، و بجوڵێتـەوە، دەگەڕێندرێتەوە بۆ لای قورئانی پیرۆز، و دواجار دەبرێتە سەر ئەو ویستەی کە نەیخواستووە، هیچ یەکێك لە سێ تەڵاقەکەی بخات.[1]

شیخ الأسلام (ئیبن تەیـمیە)، دەفەرموێت: (هەر کەسـێك ژنەکـەی تـەڵاق بدات، لە یەك وەختـی پاکیـدا، واتـە، لـە سـوڕی بـێ نوێژیـدا نـەبێت، و

---

[1] الروضة البهية، شرح اللمعة الدمشقية، للشيخ زين الدين الجبعي العاملي، ٢/١٤٨.

دەستەواژەکەی بە وشەیەك، یان چەند وشەیەك بێت، وەك ئەوەی کە بڵێت: (أنتِ طالِقٌ ثلاثاً: هەر سێ تەڵاقەکەت کەوتبێت)، سەبارەت بە حوکمی پرسێکی لەم جۆرە زانایانی پێشینە و پاشینە، سێ گوتەیان هەیە، و گوتەی چوارەم بیدعەیە، و ئەفراندنە، کە ئەویش بریتییە لەو گوتەیەی موعتەزیلەکان و شیعەکان، کە دەبێژن، (دەربڕینی دەستەواژەی، وەك سێ تەڵاقەت کەوتبێت، هیچ تەڵاقێکی پێ ناکەوێت)، کە قسەیەکی لەم جۆرە لە هیچ زانایەك، لە زانایانی پێشینان نەبیستراوە.[1]

- (پێشەوا ئیبن قەییمی جەوزی)، دەفەرموێت: ئەم مەزهەبە، پێشەوا (ئیبن حەزم) باسی لێوەکردووە، و گێڕاویەتییەوە، بۆ (پێشەوا ئەحمەد)، و ئەویش نکوڵی لێ کردووە، و بەرپەرچی داوەتەوە.[2]

- (الشیخ علی الخفیف)[3] دەڵێت: ئەمە مەزهەب، و ڕەوگەی کۆمەڵێکە لە شوێنکەوتووان، هەروەك (لیث)ی، کوڕی سەعد، و ئیبن عەلی، و هیشامی کوڕی حەکەم، و ئەبو عوبەیدە، و قاضی حەجاجی کوڕی (أرطأة)،[4] گێڕاویانەتەوە، و جەماوەری زانایانی شیعەیش، بە لایدا چوون، و کاریان پێ کردووە.

جا ئەوانەی کە گوتوویانە، تەڵاق ناکەوێت، ئەوەیان کردووە بە بەڵگە، کە کۆکردنەوەی سێ تەڵاقە، بە یەکەوە، پێچەوانەی دەقی ئایەتی: (ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖ)ـە،[5] و بێگومان پێچەوانە بوونەوە، لە

---

[1] مجموعة الفتاوی، شیخ الاسلام ابن تیمیة، ج٩ / ٣٣، چاپی کتێبخانەی مەعاریف، ریباط، وڵاتی مەغریب.

[2] زاد المعاد، للامام ابن قیم الجوزی، ج٤/ ٥٤.

[3] بڕوانە پەڕتووکی (فرق الزواج)، ل٣٢.

[4] ساڵی (١٤٥)ی، کۆچی، وەفاتی کردووە.

[5] (سورة البقرة : ٢٢٩ ).

گەڵ دەقدا، داهێنانە لـە ئاینـدا، و کـارێکی بیدعەیـە، و بیدعـەیش بـە فەرمانی پێغەمبەر، (صلى الله عليه وسلم)، بەرپەرچدراوەیە، کە دەفـەرمووێت: (مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنا فَهُوَ رَدٌّ)، هەرکەس هەرکارێك ئەنجام بدات، کە لە سەر ڕەوتی سوننەتی پێغەمبەر، (صلى الله عليه وسلم)، نەبێت، ئەوا ئەو کارەی بەرپەرچدراوەیە.[1]

## توێژینەوەی ئەم ڕایە:

١. ئەوەی کە زیادەیە، لە (یـەك) دژی دەقەکەیـە، نـەوەك هـەمووی، بۆیـە هەرکات گوتی (أنتِ طالِقٌ ثلاثاً: سێ تەڵاقەت کەوتبێت)، تەنها یەك تەڵاقی پێ دەکەوێت، و زیادەکەی بەتاڵە، و کاری پێ ناکرێت، و هەموو کارێك کـە شیاوی پارچە پارچە کردن بێت، ئەمە حاڵیەتی، کـە هەنـدێ لـە پارچـە و بەشەکانی، بە شەرعی دێتە ئەژمار، و هەنـدێکی تـر لـە پارچـەکانی، بـە ناشەرعی تەماشا دەکرێت.

٢. ئەو (ئیبـن حەزم)ـەی، کە ئەم گوتەیـەی دراوەتـە پـاڵ، کـاری بـە ڕای جەماوەری زانایان کردووە، کە دەفەرموون: پیاوەکـە چـەند تـەڵاقی خسـت، ئەوەندە تەڵاقی دەکەون، بە ڕەهایی، هەروەها دەبێژێت، ئەگەر خستنی چـەند تەڵاقێك پێکەوە، بیدعە بووایە، ئەوا دەبوو، بە بەتاڵ دابنرێـت، و بەرپـەرچ بدرێتەوە، بەڵام دیارە، کە بیدعە نییە، و بەڵکو تەنانەت دەشـگونجێت، کـە هەر سێ تەڵاقەکە پێکەوە بخرێت.

٣. لە ڕاستییدا، ئەم ڕەوگەو مەزهەبە، ڕیزپەڕ (شاذ)ـە، و نزیکە لەوەیشەوە، کە پێچەوانەی ئەو کۆڕایەیە، کە زانایانی مسوڵمان لە سەری کۆبوونەتـەوە، ئەمـەیش هـەروەك (شـێخ الإسـلام، ئیبـن تەیـمیە)، دەفـەرمووێت، ڕای شیعەکان نییە، و هەروەها وەك (الشيخ علي الخفيف)یش، دەری بـڕیوە، ڕای زۆرینەی شیعەکانیش نییە، بەڵکو زۆرینەیان لە سەر پێچەوانەی ئـەم ڕایـە

---

[1] پەڕتووکی (صحيح الإمام مسلم)، ٣٢٤٣.

دەڕۆن، و لەو بارەیەوە (طوسي)،[1] گەورە زانای شیعەکان، دەڵێت: ئەگەر پیاوەکە ژنەکەی تەڵاقدا، بە یەك دەربڕین، و بە یەکجار، ئەوە بیدعەی ئەنجام داوە، و یەك تەڵاقی پێدەکەوێت، و ئەگەر تەواوی مەرجەکانی تێدا هاتنە دی، ئەو مەرجانەی کە لە لای زۆرینەی هاوەڵانمان، دانی پیادا نراوە، هەر لە ناو شیعەکانیشدا هەیە، کە ڕای وایە، هیچ تەڵاقێکی پێ ناکەوێت، و (عەلی) و (ظاهیرییەکان)، کاریان بەم دوا گوتەیە کردووە!

بەڵام هەروەك باسمان کرد، دانەپاڵی ئەم ڕایە، لە لایەن (طوسي)یەوە، بۆ (ظاهیرییەکان)، و بەو شێوە ڕەهاییە، کارێکی دروست نییە.[2]

هەروەها لە پەڕتووکی (رِیاضُ المَسائِل)دا، هاتووە، کە دەڵێت: ئەگەر تەڵاقی سێ بە سێ، بە (دوو) تەڵاق، یان بە (سێ) تەڵاق، لێك بدرێتەوە، و شرۆڤە بکرێت، ئەوە ئەم لێکدانەوەیە، تەنها لە یەك تەڵاقدا ڕاست و دروستە، و زیاتر لەمە بەتاڵ و بێ بنەمایە، و هەر لێرەیشەوە لاوازی ئەو گوتەیە بەدەردەکەوێت، کە دەڵێت: سەراپای تەڵاقەکە بەتاڵ و پووچ و دانەمەزراوە! و مەبەستیشی لە ڕەتکردنەوەی لە فەرموودەکەدا، ئەوەیە کە دەگەڕێندرێتەوە، بۆ یەك تەڵاق، نەوەك بۆ لای هیچکامیان.[3]

کەواتە، دواجار ئەم ڕایە، کاری پێ ناکرێت، چونکە سەرەڕای ئەوەی کە بەڵگەیەکی بە دەستەوە نییە، کە پشتی پێ ببەسترێت، لە گەڵ ئەمەیشدا، ئەم ڕایە، تەنها گرووپێکی کەم و نەناسراو، دەریانبڕیوە.

---

[1] پەڕتووکی (الخلاف)ی، طوسي، ب٢، ل٨٩ ، تەماشا بکە.

[2] المحلی، لابن حزم الظاهري، ب١٠، ل١٧٤.

[3] رِیاضُ المَسائِلْ، بەرگی دووەم، كِتابُ الطَلاق.

# بەشە باسی دووەم
# جوداكردنەوەی تەلاقدانی ژنێك كە سەرجێی لەگەڵدا كرابێت لە تەلاقدانی ژنێك كە سەرجێی لەگەڵدا نەكرابێت

ئەو ڕەوتەی كـە خـاوەنی ئـەم ڕایەیـە، كۆمـەڵێكن لـە هـاوەڵانی (ئیبـن عەبباس)، و (ئیسحاقی كوڕی ڕاهەوەیهـ)ـی كـە (موحەمـەدی كوڕی نەصری مرزی) دەگێڕێتەوە، لێیـەوە، لـە پـەڕتووكی (اِختِلافُ العُلَماءْ)دا، كە دەفەرموێت: ئـەو كۆمەڵـە گوتوویانـە، ئەگـەر ئافرەتەكـە گوازرابێتەوە، و سەرجێیی لـە گەڵـدا كرابێـت، ئـەوا هـەر سـێ تەلاقەكـە دەكەوێت، و ئەگەر نەگوازرابێتەوە، ئەوا تەنها یەك تەلاقی دەكەوێت، بۆ ئەم ڕایەش هەندێ لە دۆكیۆمێنت و بەڵگەیان هێناوەتەوە، لەوانە:

١. (ئەبوداود)، گێڕاویەتییەوە، لە (طاوس)ـەوە، كە كابرایەك، كـە بـە (أبو الصهباء) ناسراو بوو، پرسیاری زۆری لە (ئیبـن عەبباس)، دەكـرد، جارێكیان پرسیاری كرد، و گوتی: ئایا دەزانیت، كە لە سەردەمی پێغەمبەر، (صلى الله عليه وسلم)، (پێشەوا ئەبوبەكر)، و سـەرەتاكانی فـەرمانڕەوایی (پێشەوا عومەر)دا، (خوایان لێ ڕازی بێـت)، هـەر پیاوێـك ئەگـەر پـێش گواستنەوە، و سەرجێیی كردن، لە گـەڵ ژنەكەیـدا، سـێ بـە سـێ تـەلاقی بخستایە، ئەوا بە یەك تەلاق بۆیان ئەژمار دەكرد، جا (ئیبـن عەبباس)، (خوا لێی ڕازی بێت)، فـەرمووی: بـەڵێ وابـوو، كـە ئەگـەر پیـاو ژنەكـەی پـێش گواستنەوە، (سێ بە سێ)، تەلاق بدایە، ئەوا بە (یەك) تەلاق، بۆیان ئەژمار دەكرد، و تەنها تەلاقێكیان پێ دەخست، بەڵام كە (پێشەوا عومەر)، (خوا لێی ڕازی بێت)، زانـی خـەڵكی لـە سـەری ڕاهـاتوون، و كارەكـەیان لا ئاسـایی

بووەتەوە، و بە دەمییەوە دەچن، بۆیە هەر سێ تەڵاقەکەی لـە سـەر هـەژمار کردن، و هەرکەس شتی وای لە دەست دەربچوایە، ئەوا هەر سێ تەڵاقەکـەی پێ دەخست.[1]

**جا زانایانی ئەم ڕەوتە، فەرموویانە:**

ـ ئەم پابەندکردنەی (پێشەوا عومەر)، (خوا لێی ڕازی بێت)، سـەبارەت بـە تەڵاقی (سێ بە سێ)، و هەژمارکردنی هەرسێکیان، بۆ ژنانی گواستـراوە، و گێڕانەوەکەی (أبو الصهباء)، بۆ ئەو ژنانەیە کە نەگوازراونەتـەوە، و دواجـار ئەم جیاکردنەوەیەی تەڵاقی (سێ بە سێ)، لەو دوو حاڵەتە جیاوازەدا، کۆك و تەبایە، لە گەڵ گێڕانەوەکانی هەر دوو ئاڕاستە جیاوازەکەدا.[2]

٢. ئەم کۆمەڵەی کە ئەم ڕایەیان هەیە، دەڵێن ژنی نەگوازراوە، و سـەرجێیی لە گەڵدا نەکراو، کە مێردەکەی پێی گوت: (أنتِ طالِقٌ: تەڵاقت کەوتبێت)، ئەوا دەبێتە (جیابووەوە: بائِنَة)، و ئیتر لێرەوە لە گەڵ دەسـتەواژەی (سـێ بـە سێ)دا، دژی یەکتری دەوەستنەوە، و کەواتە ئەو ڕایەی کە بڵێـت، هـەر سـێ تەڵاقەکەی پێ دەکەوێت، ڕایەکی بەتاڵ و بێ بنەمایە.

ـ (پێشەوا ئیبن حەجەری عەسقەلانی)، دەفەرموێت: ئاڕاستەی ئەم ڕایەی ئەم کۆمەڵە، ئەوەیە کە ژنی نەگواستراوە، لای ئەمان، هەر کە پیاوەکەی پێی گوت: (أنتِ طالِقٌ: تەڵاقت کەوتبێت)، ئیتر لێی دەپچڕێت، و جودا دەبێتەوە، کەواتە ئەگەر پێی گـوت، (سـێ بـە سـێ) تـەڵاقت کـەوتبێت، ئـەوە ئـەو ژمارەیەی بۆ هەژمار ناکرێت، و بێ بنەمایـە، چـونکە لـە دوای (بَیْنـوُنَة: جیابوونەوەکە)، کە هەر لە سەرەتاوە گوتراوە، بۆیە بێ بنەمایە.[3]

ـ لە پەڕتووکی (المَبْسوُط)دا، هاتووە، کە دەفەرموێت: ئەگەر پیاو، پـێش

---

[1] نَيل الأوطار، لِلإمام الشَوكاني، ب٦، ل٢٥٩.

[2] زاد المَعاد، لإبن القيم الجوزية، ب٤، ل٥٥.

[3] فتحُ الباري، شرح صحيح البخاري، ب٩، ل٣٦٣.

گواستنەوەی ژنەکەی، بەو ژنەی گوت، سێ تەڵاقەت کەوتبێت، ئەوا بە لای ئێمەوە، هەر سێ تەڵاقەکەی پێ دەکەوێت، و ئەمەیش فەرمایشتی (پێشەوا عومەر)، و (پێشەوا عەلی)، و (ئیبن عەبباس)، و (ئەبو هورەیرە)ی، لە سەرە، (خوا لێیان ڕازی بێت)، و (شێخ حەسەنی بەصری)، (خوا لێی ڕازی بێت)، فەرموویەتی، بە دەربڕینی (تەڵاقت کەوتبێت)، تەنها یەك تەڵاقی پێ دەکەوێت، تا ژنەکە لە عیدەدا بێت، و دەربڕینی دەستەواژەی سێ تەڵاقەت کەوتبێت، هیچ تەڵاقێکی پێ ناکەوێت، لەم کاتەدا، چونکە ئەو ئافرەتە بە دەربڕینی دەستەواژەیەکی تر، ئیدی بێگانە بووەتەوە، بە پیاوە دەزگیرانەکەی، بۆیە ئەم تەڵاقە (سێ بە سێ)یە، هیچی پێ ناکەوێت.[1]

## توێژینەوەی ئەم بەڵگە گەلە:

١. وەڵامەکەی (ئیبن عەبباس)، بە پێی پرسیارەکەی کابرا بوو، و حوکمی ئەو باس دەکات، ئەمەیش مانای ئەوە نییە، کە حوکمی ژنی گواستراوە، و سەرجێیی لە گەڵداکراو، لەم پرسەدا جیاواز بێت، و ئەو هاتنەیش بە ڕەهایی لە فەرموودەکەی (ئیبن عەبباس)دا، پشتگیری لەم فەرمایشتە دەکات، کە دەڵێت: تەڵاق لە سەردەمی پێغەمبەر، (صلى الله عليه وسلم)، و پێشەوا ئەبوبەکر، و ... هتد، تا دوایی باسەکە، کە پاشتر ڕوونکردنەوەی لە سەر دێت، زیاتر لەمەیش (پێشەوا شەوکانی)، لە پەڕتووکی (نيل الأوطار)، بەرگی (٩)، لاپەڕە (٢٥٩)دا، هێناویەتی، کە (پێشەوا نەسائی)، فەرموویەتی: ئەم گێڕانەوەیە، گێڕانەوەیەکی نەناسراو (مُنكر)ە.

٢. ئەو قسەیەی کە دەڵێت، کابرا گوتی: (أنتِ طالِقٌ: تەڵاقت کەوتبێت)، ئیتر بەم قسەیە، ئافرەتەکە دەبێتە (بائِنَة: جیابووەوە)، بۆیە ژمارەی (سێ)، لە

---

[1] المَبسُوط للسَرَخسِي، ب٦، ل٨٨.

تەلاّقەکەدا، بەتاڵ دەکاتەوە، قسەیەکی پێچەوانەی نەریت و ڕێساکانی زمانەوانییە، لە ڕووی ئەوەوە، کە دەستەواژەی (أنتِ طالِقٌ ثلاثاً: سێ تەلاّقەت کەوتبێت)، هەمووی بەستراوە، بە یەکەوە، و حاڵیبوون، وتێگەیشتن لە سەرەتاکەی بەستراوە، بە کۆتاییەکەیەوە،[1] و کردنی بە بەڵگە، وەك بەڵگەهێنانەوە، بەم ئایەتە پیرۆزە وایە، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ)،[2] نزیکی نوێژ مەکەون! و کەچی بڕگەی دواتر پشتگوێ بخەیت، کە دەفەرموێت: (وَأَنتُمْ سُكَارَى) لە کاتی سەرخۆشیدا، واتە، لە کاتی سەرخۆشیدا نزیکی نوێژکردن مەکەونەوە، بۆیە دەستەواژەی (أنتِ طالِقٌ ثلاثاً: سێ بە سێ تەلاّقت کەوتبێت)، ڕستە و دەستەواژەیەکی پێکەوە لکاوە، و دروست نییە، جیا بکرێتەوە، و بکرێت بە دوو ووشە، و هەر ووشەیەکیان حوکمێکی بدەیتێ! و ئەمەیان جیایە، لەم دەربڕینەی پیاو، کە دەڵێت (أنتِ طالِقٌ، أنتِ طالِقٌ، أنتِ طالِقٌ: تەلاّقت کەوتبێت، تەلاّقت کەوتبێت، تەلاّقت کەوتبێت)، چونکە هەر ڕستەیەك لەم سێ ڕستەیە، لەوی تریان جیاوازە، و سەربەخۆیە لێی، و حاڵی بوون لە یەکەمیان نەوەستاوە، لە سەر حاڵی بوون، لە دووەم ڕستەیان، بۆیە دروستە بگووترێت، لە کاتی ویستنی سەر لە نوێ دەستپێکردندا، ئەو ژنە بە دەستەواژەی (أنتِ طالِقٌ: تەلاّقت کەوتبێت)ـی، یەکەمیان، بووەتە بێگانە، و ئیتر ڕستەی دووەم، و سێیەم، کارپێنەکراو، و بێ بنەمان، و پووچن.

ـ لە پەڕتووکی (إختلاف ابي حنيفة، وَ ابن أبي ليلى)دا، هاتووە، کە دەڵێت: ئەگەر پیاو بە ژنەکەیی گوت، کە هێشتا نەیگواستبووەوە: (أنتِ طالِقٌ، أنتِ طالِقٌ، أنتِ طالِقٌ: تەلاّقت کەوتبێت، تەلاّقت کەوتبێت، تەلاّقت

---

[1] فتح الباري، شرح صحيح البخاري، ب٩، ل٣٦٣، و (بدائع الصنائع)، للكاساني، ب٤، ل١٨٧٥.

[2] (النساء: ٤٣)

کەوتبێت)، ئەوا بە تەڵاقدانی یەکەم، تەڵاقەکەی دەکەوێت، و تەڵاق دەدرێت، و ئیتر دوو تەڵاقەکەی تری بە سەردا نادرێت، و ئەمەیش ڕای (پێشەوا ئەبو حەنیفەﷺ)یە.[1]

[1] پەڕتووکی (اختلاف أبی حنیفه، و ابن أبی لیلی)، نووسراوی، (پێشەوا ئەبو یوسف یەعقوبی، کوڕی ئیبراهیمی ئەنصاری)، کە لە ساڵی (١٨٢)ـی، کۆچی لە دنیا دەرچووە، و مامۆستا (أبي وفاء الأفغاني) ساغی کردووەتەوە، و پەراوێزی لە سەر نووسیوە، چاپخانەی (الوفاء)، ل١٩٢، ساڵی ١٣٥٨ی کۆچی.

# بەشە باسی سێیەم
# مێردەکە چەند تەڵاقی خستبن، ئەوەندە تەڵاق دەکەون

هەندێ لە هاوەڵان، و شوێنکەوتووان، و جەماوەری شەرعزانانی مەزهەبی (حەنەفی)،[1] و (مالیکی)،[2] و (شافیعی)،[3] و (حەنبەلییەکان)،[4] و

---

[1] لە پەرتووکی (المبسوط)دا، بەرگی (٦)، لاپەڕە (٨٨)دا، هاتووە، کە دەڵێت: ئەگەر پیاوێك بە ژنەکەیی گوت، هەرچەندە گواستبوشیەوە، و سەرجێیی لە گەڵدا کردبوو، گوتی: سێ بە سێ تەڵاقت کەوتبێت، ئەوا لە لای ئێمە هەر سێ تەڵاقەکەی دەکەون، و هەروەها لە هەمان پەرتووکدا، بەرگی شەشەم، لاپەڕە (٩١)دا، هاتووە، کە دەڵێت: ئەگەر کابرایەك چوار ژنی هەبوون، و پێی وتبوون، نۆ تەڵاقەتان کەوتبێ، ئەوا سێ تەڵاقەی هەموو یەکێکیان دەکەوێت، چونکە هەر ژنە، و لە بەشی خۆی دوو تەڵاق، و چارەکێکی دەکەوێت، واتە، ئەو چارەکە تەڵاقە حوکمی تەڵاقێکی تەواوی هەیە.

[2] لە شەرحی (الخرشي)، بەرگی چوارەم، لاپەڕە (٣١)دا، هاتووە، کە دەڵێت: ئەگەر پیاو بە ژنەکەیی گوت، سێ تەڵاقەت کەوتبێت، ئەمە تەڵاقی بیدعییە، یاخود، گوتی: سێ تەڵاقەکەت کەوتبێت، هەندێ لەو تەڵاقانە سوێندن، و هەندێکیان بیدعیـن، ئەوەندە هەیە، ئەو پیاوە، هەر سێ تەڵاقەکەی لە سەر ئەژمار دەکرێت، ئیتر ئەو ژنەی گواستبێتەوە، یان نا، هەر چوونییەکـە.

[3] لە پەرتووکی (المهذّب)دا، بەرگی دووەم، لاپەڕە (٨٤)، هاتووە، کە دەفەرموێت: ئەگەر بە دەزگیرانەکەیی گوت، کە هێشتا نەیگواستووەتەوە، و سەرجێیی لە گەڵدا نەکردووە: (سێ تەڵاقەت کەوتبێت)، ئەوا هەر سێ تەڵاقەکەی دەکەون، چونکە هەر سێ تەڵاقەکە، لە سەردەمی پرۆسەی هاوسەرێتیدا خراون، بۆیە هەر سێ تەڵاقەکە دەکەون، هەروەك چۆن ئەگەر، بە ژنە گواستراوەکەی بڵێت، هەر دەکەون، بۆ دەستگیرانداریـیەکەیش هەروایە.

[4] لە پەرتووکی (المُغني)، نووسراوی زانای مەزن (ئیبن قودامەی مەقدیسی)دا، هاتووە، کە دەڵێت: ئەگەر لە کاتی پاکێتیدا، سێ تەڵاقەکەی دا، ئەوا ئەم تەڵاقانەی ناکەون، لە بەر ئەو فەرموودەگەلەی، کە لەم بارەیەوە هاتوون.

هەندێ لە (ظاهیرییەکان)[1]، ڕایان وایە کە، پیاوەکە چەند تەلاقی خستبێ، ئەوا ئەو ژمارەیە، بە ڕەهایی دەکەون، ئیتر چونیەکە، ژنەکەی گواستبێتەوە، یان نا... هەروەها چونیەکە، ژمارەی تەلاقەکە، یەك تەلاق بێت، یان دوو تەلاق، یان سێ تەلاق، لەمەیشدا پشتیان بە بەڵگەی سوننەتی پێغەمبەر، (صلى الله عليه وسلم)، و (کۆڕای زانایان: إجماع)، و (بەبەرداگرتن: قِیاس) بەستووە.

## یەکەم: سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم):

**بێژەرانی ئەم ڕایە، فەرموودەی زۆریان کردوونەتە بەڵگە بۆ خۆیان، گرنگترینیان ئەمانەی لای خوارەوەن:**

### ١ـ فەرموودەکەی (ڕەکانە):

لە (ڕەکانەی کوڕی عەبد زەید)ـەوە، گێڕدراوەتەوە، کە گوتویەتی: هاتمە خزمەتی پێغەمبەر، (صلى الله عليه وسلم)، و گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، (صلى الله عليه وسلم)، من ژنەکەمم بە تەواوەتی تەلاق دا، پێغەمبەریش، (صلى الله عليه وسلم)، فەرمووی: مەبەستت لەو تەلاقدانەدا چی بوو؟ یاخود چەند بوو؟ (ڕەکانە)، دەڵێت: منیش گوتم: مەبەستم پێی یەك تەلاق بوو، جا پێغەمبەر، (صلى الله عليه وسلم)، فەرمووی: جا سوێند بە خوا مەبەستت یەك تەلاق بوو؟ گوتم: ئەرێ وەڵلا، مەبەستم هەر یەك تەلاق بوو، پێغەمبەر، (صلى الله عليه وسلم)، فەرمووی: دەی هەر ئەوەت لە سەرە، کە ویستوتە.[2]

---

[1] لە پەڕتووکی (المحلى)دا، دانراوی (عەللامە ئیبن حەزمی ظاهیری)، هاتووە، کە دەڵێت: هەر پیاوێك بە ژنەکەی گوت، تەلاقت کەوتبێت، مەبەستیشی دوو تەلاق، یان سێ تەلاق، بوون، ئەوە بە پێی نیاز و نیەتەکەی بۆی هەژمار دەکرێت، ئیتر چونیەکە، دەربڕینەکەی گوتبێت، جا نیەتی هێنابێت، و هەروەها چونیەکە، ئەو ژنەی گواستبێتەوە، یان نەیگواستبێتەوە.

[2] (پێشەوا ئەبو داود)، و(پێشەوا تیرمیزی)، و (پێشەوا شافیعی)، و (پێشەوا حاکم)، گێڕاویانەتەوە، و (حاکم)یش، بە صەحیحی داناوە، تەماشای پەڕتووکی (التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول).

**. ڕەهەندی بە بەڵگەکردنی ئەم فەرموودەیە:**

**أ. ئەگەر ( ڕوکانە )، مەبەستی تەلاقێك زیاتر بوایە، ئەوا مەبەست و نیازەکەی خۆی بە سەردا دەکەوت، و پێغەمبەر، (صلی الله علیه وسلم)، بڕیاری بە سەردا دەدا، کە دەبێت پێوەی پابەند بێت.**

**ب. ئەگەر کۆکردنەوەی سێ تەلاق، بە یەکەوە، و لە یەك جار، و لە یەك کاتدا، دروست نەبووایە، ئەوا پێغەمبەر، (صلی الله علیه وسلم)، داوای شیکردنەوە، و شرۆڤەکردنی نیازەکەی (ڕوکانە)ی، لە ژمارەی تەلاقەکاندا نەدەکرد.**

## ٢. فەرموودەکەی ئیبن عومەر:

**١. گێڕدراوەتەوە، کە (عەبدوڵلای کوڕی عومەر)، (خوا لە خۆی، و باوکی ڕازی بێت)، یەك تەلاقی ژنەکەی دا، کە لە کاتی بێ نوێژیدا بوو، دواتر ویستی، کە لە دوو حاڵەتی بێ نوێژی تردا، ئەو دوو تەلاقەکەیشی بدات، ئەم هەواڵە گەیشت، بە پێغەمبەر، (صلی الله علیه وسلم)، و ئەویش پێی فەرموو: ئەی ئیبن عومەر، خودای مەزن بەو جۆرە فەرمانی نەکردووە، و تۆ بە هەڵە لە سوننەت حاڵی بوویت، چونکە وا سوننەتە، کە پاك ببێتەوە، ئینجا**

---

بەرگی دووەم، لاپەڕە (٣١١) بکە، و لە پەڕتووکی (نیل الأوطار)دا، بەرگی شەشەم، لاپەڕە (٢٥٥)دا، هاتووە، کە دەڵێت: گێڕدراوەتەوە، لە (ڕەکانەی کوڕی عەبدوڵلا)وە، کە (سوهەیمە)ی، خێزانی، بە یەکجاری، و بە تەواوی تەلاق دا، هەواڵی ئەم کارەی دا، بە پێغەمبەر، (صلی الله علیه وسلم)، و پێی گوت، سوێند بە خوا، مەبەستم لەو یەکجارییە، تەنها یەك تەلاق بوو، جا پێغەمبەر، (صلی الله علیه وسلم)، فەرمووی: بڵێ، بە خودا، مەبەستم لەو یەکجارییە، تەنها یەك تەلاق بووە، جا (ڕوکانە) دەڵێت: گوتم، سوێند بە خوا، مەبەستم لەو یەکجارییە، تەنیا یەك تەلاق بوو، جا پێغەمبەر، (صلی الله علیه وسلم)، بڕیاری گەڕانەوەی (سوهەیمە خان)ی، دایەوە بۆ لای، و پاشان دووەم جار، یاخود دووەم تەلاقیدا، لە سەردەمی پێشەوا عومەر)دا ﷺ و لە سەردەمی (خەلیفە عوسمانی کوڕی عەفان ﷺ)دا، تەلاقی سێیەمی دا، (ئەم فەرموودەیە، ئیمامی شافیعی، و پێشەوا ئەبوداود، گێڕاویانەتەوە).

تەڵاقی بدەیت، جا دەڵێت، پێغەمبەر، (صلى الله عليه وسلم)، فەرمانی پێکردم، کە ژنەکە بگێڕمەوە، ژێر نیکاحی خۆم، و منیش وامکرد، و پاشان پێغەمبەر، (صلى الله عليه وسلم)، فەرمووی: هەر کات پاك بوویەوە، ئەوا ئەو کاتە تەڵاقی بدە، یان لە لای خۆت گلی بدەرەوە، جا گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، (صلى الله عليه وسلم)، ئەگەر سێ تەڵاقەی بدەم، ئایا دروستە بۆم، کە بیگێڕمەوە، لای خۆم؟ پێغەمبەر، (صلى الله عليه وسلم)، فەرمووی: نەخێر! ئەوە جیابووەتەوە لێت، و کاری وا بکەیت، بە تاوانکاری بۆت دێتە ئەژمار.[1]

<u>رەهەندی بە بەڵگەکردنی ئەم فەرموودەیە:</u>

لە ڕاستییدا، فەرمایشتەکەی پێغەمبەر، (صلى الله عليه وسلم)، کە فەرمووی: ئەوە ئیتر جیابووەتەوە لێت، و لێت بووەتە بێگانە، و توخنکەوتنی تاوانە، بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە خستنی سێ تەڵاقە، بە یەکجار، و لە یەك کاتدا، حوکمێکی دروستە، بەڵام بکەرەکەی تاوانبارە.

## ٣ـ فەرموودەکەی عوبادەی کوڕی صامت:

(ئەبوداود ﷺ)، لە (عوبادەی کوڕی صامت)ەوە، گێڕاویەتییەوە، کە گوتوویەتی: باوام هەزار تەڵاقی ژنەکەی دا، جا ڕۆیشت، بۆ خزمەتی پێغەمبەر، (صلى الله عليه وسلم)، و ئەم حاڵەی بۆ باسکرد، جا پێغەمبەر، (صلى الله عليه وسلم)، فەرمووی: بە ڕاستی باپیرت لە خوا نەترس بووە!! کە گفتی لەم جۆرە هاتووە، بە دەمیدا، جا سێ تەڵاقەکەی لە سەریەتی، و کەوتوون، بەڵام سەبارەت بە نۆسەد، و نەوەد، و حەوت، تەڵاقەکەی تر، بە ڕاستی ئەمە زیادەڕەوی، و ستەمکارییە، کردوویەتی، جا خودای مەزن سەرپشکە، یان لە سەری سزای دەدات، و یان لێی دەبورێت.[2]

---

[1] السنن الكبرى، للبيهقي، ب٧، ل٣٣٤. نيل الأوطار، ب٦، ل٢٥٦.

[2] صحيح مسلم، بشرح النووي، ب١٠، ل٦٢.

### ٤ـ فەرموودەکەی عوەیمیری عەجلانی:

لە (سەهلی کوڕی سەعد)ـەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە گووتویەتی: کەوا کەسێك لە تیرەی (عەجلان)، (نەفرینکاری:مُلاعَنَة)ـی، ژنەکەی کرد، پاشان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، (صلى الله عليه وسلم)، ئەگەر لە لای خۆم بیهێڵمەوە، ئەوا ستەمی لێدەکەم، بۆیە تەلاقی کەوتبێت، تەلاقی کەوتبێت، تەلاقی کەوتبێت، واتە، سێ جار تەلاقی خست، لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە، کە گوتوویەتی: ئەگەر بیگێڕمەوە، درۆم لە گەڵدا کردووە، پاشان هەر سێ تەلاقەی دا، و لە هەر گێڕانەوەیەکی تریشدا هاتووە، کە دواتر بە سێ جار تەلاقی دا.[1]

جا زانایانی سەر بەم گرووپەی کە ئەمە ڕایانە، گوتوویانە، خستنی سێ تەلاق، لە خزمەت پێغەمبەردا، (صلى الله عليه وسلم)، و نکوڵی لێنەکردنی، لە لایەن پێغەمبەرەوە، (صلى الله عليه وسلم)، بەڵگەیە لە سەر ڕازی بوونی پێغەمبەر، (صلى الله عليه وسلم)، پێی!

### ٥ـ فەرموودەکەی عائیشەخانی دایکمان (خوا لێی ڕازی بێت):

(قاسمی کوڕی موحەممەد)، لە (عائیشەخانی دایکمانەوە)، گێڕاویەتییەوە، کە پیاوێك ژنەکەیی تەلاق داوە، دواتر ژنەکە شووی کردەوە، و دیسان کابرای دووەمیش تەلاقی دا، جا پرسیاریان لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کرد، ئایا بۆ پیاوی یەکەمی حەڵاڵ بۆتەوە؟ پێغەمبەر، (صلى الله عليه وسلم)، فەرمووی: نەخێر! تا کابرا تام و چێژ، و خۆشی جوتبوون نەچێژێت، لەو ژنە، و ژنەکە نەیچێژێ، لە پیاوەکەی دووەم، بۆ کابرای یەکەم حەڵاڵ نابێتەوە.[2]

جا زانایانی ئەم گروپە، گوتوویانە، کە پێغەمبەر، (صلى الله عليه وسلم)،

---

[1] سنن النسائي، ب٦، ل١٤٦.

[2] فتح الباري شرح صحيح البخاري، ب٩، ل٣٦٢، السنن الكبرى، للبيهقي، ب٧، ل٣٣٤.

نکۆڵی لەم کارە نەکردووە، و بەرپەرچی نەداوەتەوە، و بەڵکو لە کابرای یەکەمی حەرام کردووە، تا لە گەڵ پیاوی دووەم نەخەوێت، و تام لە یەکتری نەکەن، ئینجا بۆ پیاوی یەکەم حەلاڵ دەبێتەوە، ئەمەیش بەڵگەیە لە سەر دروستی کۆکردنەوەی سێ تەلاٌقەکە پێکەوە.

## ٦ـ فەرموودەکەی مەحموودی کوڕی لەبید (خوای لێ رازی بێت):

(پێشەوا نەسائی رحمه الله)، لە (مەحموودی کوڕی لەبید)ەوە رضي الله عنه گێڕاویەتییەوە، کە فەرموویەتی: عەرزی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کرا، کە ئەو پیاوە ژنەکەی خۆی (سێ بە سێ)، بە سەریەکەوە، تەلاٌق داوە، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بە تووڕەیی هەڵسا، و فەرمووی: ئەمە چۆن حاڵێکە، من خۆم هێشتاکە ماوم، و شەو و ڕۆژ، لە ناوتاندام، کەچی گاڵتە بە نامەی خودا دەکرێت، وە بە پێی ئایەتی،(ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ)، ڕەفتار ناکرێت، جا دەبێ لە پاش من چی فەرتەنەیەك بەرپا بکرێت؟ جا لەم سەروبەندەدا، پیاوێك هەڵسایەوە، و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، (صلی الله علیه وسلم)، نەیکوژم؟!!

(پێشەوا ئیبن کەسیر رحمه الله)، دەفەرموێت: (إسنادە جید)، سەنەد و ڕشتەکەی باشە، و (حافظ ئیبن حەجەری عەسقەلانی رحمه الله)، لە پەرتووکی (بلوغ المرام)دا، دەنووسێت: (گێڕەرەوەکانی ئەم فەرموودەیە، متمانە پێکراون)[1].

جا زانا پەیڕەوکارەکانی ئەم ڕەوگەیە، فەرموویانە، کە تووڕەبوونی پێغەمبەر، (صلی الله علیه وسلم)، بەڵگەیە لە سەر کەوتنی هەرسێ تەلاٌقەکە پێکەوە، و ئەگەر ئەو تەلاٌقانە هەر سێکیان نەکەوتنایە، ئەوا پێویستی بە تووڕەبوون

---

[1] نيل الأوطار، للإمام الشوكاني، ب٦، ل٢٥٥، التاج الجامع للأصول ، ب٢، ل٣١٢.

نەدەکرد، چونکە کارێك نەهاتبێتە دی، ئیتـر تووڕەبوونی بۆچییە؟!

## ٧ـ فەرموودەکەی فاطمەی کچی قەیس:

گێڕدراوەتەوە، کە (عەمری کوڕی حەفصی مەخزومی)، ئەم (فاطیمەی کچی قەیس)ـە، کە ژنی بوو، سێ بە سێ تەڵاقی دا، جا (خالیدی کوڕی وەلیـد)، (خوا لە هەموویان ڕازی بێت)، و گرووپێك لە هۆزی (مەخزومییەکان)، ڕۆیشتنە خزمەت پێغەمبەر، (صلی الله علیه وسلم)، و عەرزیان کرد، ئـەی پێغەمبـەری خوا، (صلی الله علیه وسلم)، (ئەبو عەمری کوڕی حەفصی مەخزومی)، تەڵاقی (فاطیمە خانی کچی قەیس)ـی، داوە، بـە تـەڵاقی سـێ بـە سـێ، ئایـا لـە سەریەتی نەفەقە، و بژێوی بۆ دابین بکـات؟ جـا پێغەمبـەر، (صـلی الله علیـه وسلم)، لە وەڵامیاندا فەرمووی: نەخێر! نـە بـژێوی لـە سـەرە، نـە شـوێنی نیشتەجێبوون، تا بۆی دابین بکات.[1]

جا زانایانی ئەم ڕەوتە فەرموویانە: ئەگەر هەر سێ تەڵاقەکـەی نەکەوتایـە، ئەوا بژێوی دانی ژنەکەی لە سەر بوو، چونکە ئەو ژنەی کە بە تەواوی تەڵاق نەدراوە، و سەرجەمی تەڵاقەکانی نەکەوتوون، واتە، تەڵاقەکەی ڕەجعییـە، و لە سەر پیاوەکەی پێویستە کە بژێوی بۆ دابـین بکـات، و هـەروەها شـوێنی نیشتەجێبوونی بۆ دەستەبەر بکات، ئەمەیش کۆڕای زانایانی لە سەرە.[2]

## ٨ـ فەتواکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (خوا لێیان ڕازی بێت) بەپێچەوانەی گێڕانەوەکەیەتی:

(عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس)، (خوا لێیان ڕازی بێت)، دەفەرموێت: جاران لە سەردەمی پێغەمبەر، (صلی الله علیه وسلم)، خۆیدا، و لە سەردەمی جێنشینی (پێشەوا ئەبوبەکر)دا رضي الله عنه تەڵاقی سـێ تەڵاقـە، یـەك تـەڵاق بـوو، تـا دوو

---

[1] سنن النسائي، ب٦، ل١٤٥. صحيح مسلم، بشرح النووي، ب١٠، ل١٠٣.

[2] السنن الكبرى، ب٧، ل٣٣٤.

ساڵیش، لە سەردەمی جێنشینی (پێشەوا عومەر‌ﷺ)، ڕۆیشت، ئەم حاڵە هەروا مابوو، لە پاشا (پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب‌ﷺ)، فەرمووی: ئەم خەڵکە لە پێشدا، لەم کارەدا بە شێنەیی بوون، و پشوو درێژ بوون، بەلاَم ئێستا سەریان تێکردووە، و زۆر لێی بە پەلەن، کەوابوو، با حوکم بکەین، بە کەوتنی سێ تەلاَقە، جا لە پاش ڕاوێژکردن، لە گەڵ یارانیدا، بۆ ئەم پرسە، حوکمی کرد، بە کەوتنی هەر سێ تەلاَقی (سێ بە سێ).[1]

**جا (عەبدوڵلاَی کوڕی عەباس)، (خوا لێی ڕازی بێت)، بە پێچەوانەی ئەم گێڕانەوەیەی خۆیەوە فەتوای داوە:**

(ئەبوداود)، لە ڕێگای (موجاهید)ەوە،‌ﷺ هێناویەتی، کە گوتوویەتی: لە خزمەت (عەبدوڵلاَی کوڕی عەبباس)دا، (خوا لێیان ڕازی بێت)، دانیشتبووم، کابرایەك هاتە خزمەتی، و گوتی، کە ژنەکەی بە تەلاَقی سێ بە سێ تەلاَق داوە، جا (عەبدوڵلاَی کوڕی عەبباس)، بێدەنگ بوو، تا وا گومانم برد، کە ژنەکە دەگێڕێتەوە، بۆ ژێر نیکاحی کابرا، و تەلاَقەکانی بە یەکجاری ناخات، کەچی فەرمووی: هەڵ ئەکەوێ! تیاتاندا، کە خۆی تووشی کەودەنی و هەرزەگۆیی دەکات! و دواتر کابرا گوتی: ئەی ئیبن عەباس!! پەروەردگاریش فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا[2]﴾، هەرکەس لە خوا بترسێت، خوا دەرووی خێری لێ دەکاتەوە، و ڕزگاری دەکات، تۆ لە خوا ناترسیت؟ هیچ چارەتم پێ ناکرێ، لە گێڕانەوەیەکی تردا، دەڵێت، دەرویەکت بۆ شك نابەم، سەرپێچی پەروەردگارت کردووە، و دواجار ژنەکەیشت بە (بائِنَة)ـی، تەلاَقی کەوتووە، و ئێستا بێگانەیە پێت، و لە کۆڵت بووەتەوە.[3]

**جا زانایان کاریان بە فەتواکەی (عەبدوڵلاَی کوڕی عەبباس)،**

---

[1] صحيح مسلم، بشرح النواوي، ب١٠، ل٦٩، و سُبُلُ السَلام، ب٣، ل٢٢٥.

[2] سورة الطلاق:٢

[3] عمدة القاري، شرح صحيح البخاري، ب٢٠، ل٢٣٣.

کـردووە، نـەوەك بـە گێڕانەوەکـەی، و وەڵامـی گێڕانەوەکەیشـیان داوەتەوە، و چەندەها وەڵامی بەرفراوان، و زۆر، و هەندێ جاریش مانـای بەلاڕێـدا بـراو (تأویل)یـان، بـۆ کـردووە، کـە هەنـدێ لـەو تەئویلانـە مانایـەکی نزیکـی بەرجەسـتە کـردووە، و هەندێکیشـیان مانای دووریان تیادا دەفامرێتەوە.

## گرنگترین وەڵام و بەرپەرچدانەوەکانی زانایان بۆ ئەم گێڕانەوەیە:

١. یەکێك لەو وەڵامانە ئەوەیە کە گوتوویانە ئەوە فەرموودەیەی کە باس لەوە دەکات سێ تەڵاقە بەیـەك تـەڵاقی هـەژمار کـراوە فەرموودەیـەکی سـڕاوە (منسوخ)ـە:

١. یەکێك لەو وەڵامانە، ئەوەیە کە، گوتوویانە،.ئەو فەرموودەیەی کە بـاس لەوە دەکات، سێ تەڵاقە، بە یەك تـەڵاقی هـەژمار کـراوە، فەرموودەیـەکی (سڕاوە: مَنسوُخ)ـە:

(پێشەوا عەینی)، دەفەرموێت: (پێشەوا طەحـاوی)، (ڕەحـــمەتی خـوا لـە هــەردووکیان بێــت)، وەڵامــی ئــەو فەرموودەیــەی (عەبــدوڵڵای کــوڕی عەبباس)ـی، داوەتەوە، کە پوختەکەی ئەوەیە، کە بە (سڕاوە: مَنسوُخ) هەژماری کردووە.

ڕوونکردنەوەی ئەم قسەیەی سەرەوە ئەوەیە، کە کاتێـك (پێشـەوا عومـەر)، (خوا لێی ڕازی بێـت)، فەرمووی: هۆ خەڵکینە، خوای پەروەردگار، لـە پرسـی تەڵاقدا، شێنەیی، و لەسەرخۆیی، لە سەر داناون، واتە، تەڵاق ـ تەڵاق، جا لە ڕاستییدا، هەر کەسێك پەلە لەم پرسە هێـواش ڕەودا بکـات، و هـەر سـێ تەڵاقەکە بە یەکەوە بـخات، ئەوا ئۆباڵەکەی دەخەینە گەردنی، جا کـە ئـەم فەرمایشتەی فەرموو، هیچ کەسێك نکۆڵی لێ نەکرد، و بەرپەرچی نەدایەوە، و هیچ بەرگریکارێکیش نەبوو، تا بەرگری بکات، و پێچەوانەی بوەستێتەوە، و ئەمەیش مـەزنترین دۆکیۆمێنت، و بەڵگەیە لە سـەر سـڕانەوەی (مَنسـوُخ)

بوونەوەی، ئەو بڕیارەی پێشوو.

- جا هەروەك (پێشەوا عەینی)، بۆمانی گواستووەتەوە، بەوەی کە (پێشەوا طەحاوی)، فەرموویەتی: ئەگەر بڵێیت، ئەم نەسخە چۆن دروستە، لە کاتێکدا، کە (پێشەوا عومەرﷺ)، نەسخی نەکردووەتەوە، یاخود چۆن پرسی (سڕینەوە: نەسخ)، لە دوای پێغەمبەر، (صلی الله علیه وسلم)، دروستە؟ منیش دەڵێم: کاتێك کە (پێشەوا عومەر)، (خوای لێ ڕازی بێت)، وتاری بۆ هاوەڵان خوێندەوە، باسی ئەم پرسەی کرد، و کەس نکوڵی لێوە نەکرد، و بەرپەرچی نەدایەوە، ئیتر ئەم بێدەنگیی جەماوەری هاوەڵانەﷺ، (کۆڕا: إجماع)ـی، لێ بەرپا بوو، جا نەسخکردنەوەیش بە ئیجماع، لە لای هەندێ لە زانایانمان دروستە، و دەکرێت، ڕوو بدات، بە پێی ئەوەی کە ئیجماع، پێویستکاری (زانستی دڵنیاکەرەوە: عِلْمُ الیَقِین)ـە.

پاشان دەفەرموێت: ئەگەر بڵێین، ئەم ئیجماعەی ئەو خەڵکە، لە سەر ئەو پرسی نەسخبوونەوەیە، هەر لە خۆیانەوە، و بە بێ بەڵگە بووە، و دواجار شتی وا بێ بەڵگەیش دروست نییە! ئەوا لە وەڵامدا دەڵێم: دەگونجێت کە لە لای ئەوان دەقێك دەرکەوتبێت، کە پێویستکاری ڕوودانی ئەو نەسخە بێت، بەڵام ئەو دەقە نەگوازراوەتەوە، بۆ لای ئێمە.

- (پێشەوا بەیهەقی)یش، لە (پێشەوا شافیعی)یەوە، (ڕەحمەتی خوا لە هەردووکیان بێت)، بۆمانی گواستووەتەوە، کە فەرموویەتی: لەوە دەچێت، کە (عەبدوڵلای کوڕی عەبباس)، (خوا لێی ڕازی بێت)، شتێکی زانیبێت، کە نەسخکەرەوەی ئەو حوکمە بێت.[1]

۲. هەندێ لە زانایان گوتوویانە: کە مانای گوتەی: (سێ تەلاق، یەك تەلاق بووە)، ئەوەیە کە خەڵکی لە سەردەمی پێغەمبەردا، (صلی الله علیه وسلم)، یەك تەلاقیان دەخست، چونکە ئەو خەڵکە لەو سەردەمەدا، هەر لە

---

[1] السنن الکبری، للبیهقي، ب٧، ل٣٣٨. الروض النضیر ، ب٣، ل١٤٨.

بنەڕەتدا سێ تەلاقەیان نەدەخست، یاخود زۆر بە کەمی بێژەی لەو جۆرە بە دەمیاندا دەهات، بەلام لە سەردەمی (پێشەوا عومەرﷺ)دا، خەلکی ئیتر بە زۆری سێ تەلاقەیان بە دەمدا دەهات، و جا ئەم شرۆڤە دوور مەودایە، (تەئویل)ـە، لە لایەن (پێشەوا ئیبن عەرەبی)یەوە، بە لە پێشتر داینـاوە، واتە، (تَرْجیح)ـی، داوە، و داویشیەتیە پاڵ (ئەبو زەرعەی ڕازی)، و هەر بەم شێوازەیش (پێشەوا بەهەیقی)، بە ڕشتە ساغەکەی خۆی هێناویەتی، تا گەیاندویەتییەوە، سەر (ئەبو زەرعە)، (خوا لە هەموویان ڕازی بێت).

ـ (پێشەوا نەواوی)، (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، دەفەرموێت: لە بەر ڕۆشنایی ئەم گێڕانەوەیەدا، دەردەکەوێت، کە ئەم هەواڵە لە ئەنجامی گۆڕان بە سەردا هاتنی نەریت، و ڕەوشتی خەلکەوە ڕوویداوە، نەوەك لە گۆڕانی حوکمی شەرعەوە، لە سەر پرۆسەکە[1].

٣ـ هەندێ لە زانایانیش وەلامیان بەو جۆرە داوەتەوە کە: ئەم دەستەواژەیەی، (سێ تەلاقە)، جاران بە (یەك تەلاق)، هەژمار دەکرا، لە شێواز، و باو، و بەندێکی، تایبەتدا هاتووە، جا (ئیبن سورەیج)، و زانای تریش گوتوویانە، کە ئەم دەستەواژەیە، لە وێنەی ئەو دەستەواژانەیە کە هاتوون، لە پرسی دووبارە کردنەوەی بێژەکەدا، وەك ئەوەی کە بلێت: (أنتِ طالِقٌ: تەلاقت کەوتبێت)، (أنتِ طالِقٌ: تەلاقت کەوتبێت)، جا لە سەردەمی سەرەتای ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە، لەبەر ئەوەی کە خەلکی دەروون پاك، و نیاز خاوێن، بوون، ئەوەیان لێ وەردەگیرا، کە ئەگەر بیانوتایە مەبەست لە تەلاقی دووەم، جەختکردنەوە بووە، لە تەلاقی یەکەم، بەلام کە خەلکی زۆر بوون، لە سەردەمی (پێشەوا عومەر)دا، (خوا لێی ڕازی بێت)، و فێل و فەرەز تەشەنەی کرد، ئیتر ڕێگری کرا، لەوەی کە تەلاقی دووەمی بە جەختکردنەوە (تأکید) بۆ هەژمار بکرێت، بۆیە (پێشەوا عومەر)، (خوا

---

[1] السنن الکبری، للبیهقي، ب٩، ل٣٣٨. الروض النضیر، ب٣، ل١٤٨.

لێی ڕازی بێت)، لەفزی دووەمی تەلاٌقەکەی بە دووبارە دانا، و لـە سـەری هـەژمارکردن، کـە بێگومـان ڕووکەشـی دەربڕینەکـەیش هەروایـە، و ئـەم وەلاٌمـەیش (پێشـەوا قورطـوبی)، پێـی قایلـە، و (ئیمـامی نەواوی)یـش، فەرموویەتی: ئەم وەلاٌمە، دروستتـرینی وەلاٌمەکانە.[1]

**٤ـ هەنـدێ لـە زانایـان تانـەیان لـە گێڕانەوەکـەی عەبدوڵڵای کـوڕی عەبباس داوە:**

هەروەك (پێشەوا ئـیبن حەجـەری عەسـقەلانی)، (ڕەحـمەتی خـوای لێ بێـت)، بۆمانی گواسـتووەتەوە، و دەڵێـت: (پێشـەوا قـورطـوبـی)، لـە پـەڕتووکی (الـمفهم)دا، نووسیویەتی: سەرەڕای بوونی ناکۆکی لـە گـەڵ گێڕانەوەکـەی (ئیبن عەبباسﷺ)دا، دژواری و شڵەقانێك لە دەربڕینی لەفزەکەیشدا هەیە، و ڕووکەشی دەستەواژەکەی ئەوەی لێ دەفامرێتەوە، کە ئەو گێڕانەوەیـە، لـە سەرجەمی هاوەڵانەوەﷺ بێت، چونکە زۆرینەیان شایەتحاڵی بوون، ئـیتر لـە پرسێکی لەم جۆرەدا، شتێکی سروشتییە کە بڵاو ببێتەوە، و دەنگ بداتەوە، و جەماوەرێکی زۆر گوێبیستی بن، ئیتر چۆن تەنها کەسێك تاك ببێتەوە، و لە تاقە کەسێکی تری بگێڕێتەوە؟! پاشان دەڵێت : ئەم ڕەهەندە خوازیاری ئـەوە دەبێت، کە ئەگەر بە یـەکجاری لـە کاریشـی نـەخات، بڕیـاری بـەتاڵی، و پووچەڵیشی نەدات، و بـە لایـەنی کەمـەوە دەبێـت، خوازیـاری وەسـتاندنی کارکردنی بێت، بە ڕووکەشەکەی.[2]

ـ زانایان فەرموویانە: ئەم فەرموودەیە، تەنها (پێشەوا موسلیم)، (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، گێڕاویەتییەوە، و (پێشەوا بوخاری)، (ڕەحـمەتی خوای لێ بێت)، نەیگێڕاوەتـەوە، و خـودی (عـەبـدوڵڵای کـوڕی عـەبباسﷺ)یـش، بـە

---

[1] فتح الباري شرح صحيح البخاري، ب٩/ ٣٦٤.

[2] سەرچاوەی پێشوو، (فتح الباري، شرح صحيح البخاري).

پێچەوانەی گێڕانەوەکەی خۆی کاری کردووە.[1]

ـ لێرەدا وەڵامگەل و شرۆڤەی دوورمەودا (تأویل)ـی، زۆر هەن، بۆ گێڕانەوەکەی (ئیبن عەبباس)،( خوا لێی ڕازی بێت)، کە دەرفەتی پەخشکردنیان، و باس لێوەرکردنیان نییە، جا هەرکەس درێژەی ئەم باسەی پێویستە، با بگەڕێتەوە بۆ پەرتووکە بڕوا پێکراوەکانی فەرموودە.[2]

## دووەم: کۆڕا (الإجماع):

ئەو کۆمەڵەیەی کە ڕایان وایە، کە سێ تەڵاقە، بە یەکجار، هەرسێکیان دەکەون، ئەو (کۆڕا بێدەنگە: الإِجْماع السُكوُتي)یە، دەکەنە بەڵگە، کە لە سەردەمی (پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب)دا، (خوا لێی ڕازی بێت)، هاتەدی، و گرێدرا، و هەروەها گوتوویانە، ئەو فەرموودە (تاکەوە بوو: آحاد)ـە، ئەگەر مانای ئەوە بگەیەنێت، کە تەڵاقی سێ بە سێ، یەك تەڵاقی پێ دەکەوێت، ئەوا هەرگیز هێز و توانای ئەوەی نییە، کە لە بەردەم بەڵگەی ئیجماعدا بوەستێت، کە جەختکەرەوەیە، لە سەرکەوتنی هەر سێ تەڵاقەکە.

(پێشەوا ئیبن حەجەری عەسقەلانی)، دەفەرموێت:[3] ئەوەی لەم پرسەدا هاتووەتە گۆڕێ، و ڕوویداوە، هاوڕێنەی ئەوەیە، کە لە پرسی هاوسەرگیری (کاتیی: الـمُتْعَة)دا، ڕوویداوە، و چوونیەکن، جا ڕای لە پێشتر (الراجِحْ)، لە هەر دوو ئەم پرسەدا، بریتییە لەوەی کە ئەو هاوسەرگیرییە کاتییە حەرامە، و هەروەها خستنی هەر سێ تەڵاقەکە، بە یەکجار هەر حەرامە، بە هۆی بوونی ئەو ئیجماعەوە، کە لە سەردەمی (پێشەوا عومەری

---

[1] زادُ الـمَعاد، ب٤، ل٦٠.

[2] وەك پەرتووکی (فتح الباري)، (عمدة القاري)، ب٢٠، ل٢٣٣ـ ٢٣٤، (نيل الأوطار)، ب٦، ل٢٦٢ـ ٢٦٣، (سبل السلام)، ب٢، ل٢٢٦، و دواتریش.

[3] فتح الباري، شرح صحيح البخاري، ب٩، ل٣٦٥.

کوڕی خەطاب)دا، (خوا لێی ڕازی بێت)، گرێدرا، و هاتە گۆڕێ، لە سەری، و نەزانراوە، کە کەسێکیش بەرپەرچی حەرامی هیچ کام لەم دووانەی دابێتەوە.

## سێیەم: بەبەرداگرتن (القیاس):

زانایانی ئەم ڕەوتە، دەڵێن: تەڵاقی سێ بە سێ، مافێکە لە مافەکانی پیاو، بۆیە دەتوانێت، کە بە یەکجار هەرسێکیان بخات، بە پێی یاسای (بە بەرداگرتن: القِیاس)، کە یەکێکە لە بەڵگە شەرعییەکان، هەروەك لە مافەکانی تریشدا، هەمان مافی هەیە، و ڕێگای پێدراوە.

- لە پەرتووکی (المُغني)[1]دا، هاتووە، کە دەڵێت: لەبەر ئەوەی کە گرێبەستی هاوسەرێتی (النِکاح)، موڵکە، و خاوەندارێتی تیایدا هەیە، ئەوا لادان و لابردنی بە جیاجیا، یاخود بە یەکەوە، هەر دروستە، وەك سەرجەم موڵکەکانی تر، واتە، قیاسیان کردوون، لە سەر یەکتری، و هەروەها قیاسیان کردووە، لە گەڵ پرسی (النُذور: پەیمانەکان)، و (الأیمان:سوێندەکان)، و زانای پایەبەرز (ئیبن ڕوشد)، گوتوویەتی: هەرکەس تەڵاقی چوواندبێت، بەو کردەوانەی کە ئەوەیان تیادا بە مەرج گیراوە، کە کاتێك دروست، و تەواون، کە مەرجە شەرعییەکانیان تیادا هاتبێتە دی، وەك گرێبەستی هاوسەرێتی (النِکاح)، و کڕین و فرۆشتنەکان، (البُیوُعْ)، ئەمانەی ئەم ڕەوتە پابەند ناکرێن، بە سەرجەمی ژمارەی تەڵاقەکانەوە، واتە، هەرچەندێکی خستبن، بە ڕەهایی سەرجەمیان ناکەون، و هەرکەس تەڵاقی چوواندبێت، بە پرسی (النُذور: پەیمانەکان)، و (الأیمان:سوێندەکان)، کە لەمانەدا مرۆڤ، هەرچی لە سەر خۆی پێویست کرد، دەبێت پێوەی پابەند بێت، و وەك خۆی پراکتیزەی بکات، ئەوا تەڵاق لای ئەم پێرە، بەو شێوازەی کە تەڵاقخۆرەکە ویستویەتی، دەکەوێت، واتە، چەند تەڵاقی خستووە، ئەوەندە

---

[1] المغني، وَ الشرح الكبير، ب٨، ل٢٤٣.

دەکەون.[1]

## توێژینەوە و شەنوکەوکردنی ئەم بەڵگە گەلە:

١. **فەرموودەکەی ڕوکانە ناکرێتە بەڵگە:** چونکە ئەم فەرموودەیە، ژمارەیەکی زۆر لە زانایانی فەرموودە، وایان داناوە، کە دەستەواژەی (البَتَّـةَ: بە یەکجاریی)، تێك شڵەقاوە، و تێکەڵ بە تێکستی فەرموودەکە کراوە، و نادروستە، و لە ڕشتەی فەرموودەکەدا، کەسانی نەناسراو، و تانەلێدراو هەن، و هەروەها لەبەر ئەوەی کە بە چەندەها گێڕانەوەی جیاجیا، و ڕشتە، و سەنەدی جۆراوجۆر گێڕدراوەتەوە.

- پێشەوا شەوکانی، (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، دەفەرموێت: (ئیمامی تیرمیزی)، (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، فەرموویەتی: سەبارەت بەم فەرموودەیە، و ڕشتەکەی پرسیارم لە موحەممەد، (واتە ئیمامی بوخاری) کرد، ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: ئەم فەرموودەیە، شڵەقان و ناسەقامگیری تێدا هەیە، دواتر پێشەوا شەوکانی، (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، لەسەر فەرمایشتەکەی بەردەوام دەبێت، و دەفەرموێت: زیاتر لە زانایەك، ئەم فەرموودەیەیان بە لاواز داناوە، و هەروەها گووتراویشە، کە فەرموودەیەکی (وەلانراو:مَتْرُوك)ـە.

ئیمامی تیرمیزی،(ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، لە (ئیمامی بوخاری)یـیەوە، گێڕاویەتییەوە کە، فەرموودەیەکە شڵەقان و ناکۆکی تیادایە، و لەگێڕانەوەیەکدا بە (سێ بە سێ) هاتووە، کەچی لە گێڕانەوەی تردا، بە یەك تەڵاقە دەربڕدراوە، و سەرەڕای لاوازییەکەی شڵەقاو، و ناکۆك و ناجێگیریشە.[2]

---

[1] بدایة المجتهد، وَ نهایة المقتصد، ب٢، ل٥١.

[2] بۆ درێژەی ئەم باسە تەماشای پەرتووکی (نیل الأوطار، شرح منتقی الأخبار، من احادیث سید الأخیار)ـی، پێشەوا شەوکانی بکە. ب٦، ل ٢٥٥، و دواتریش.

ـ (شيخ الإسلام، ئیبن تەیمیە)،(ڕەحمەتی خوای لیّ بێت)، دەفەرموێت: ئەو پێشەوا مەزنانەی کە زانا بوون، بە گرفت و نەخۆشییەکانی فەرموودە، و هەروەها شارەزا و زانا بوون بە شێوازی تێگەیشتن، و حاڵیی بوون لە فەرموودە، وەك (پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)، و (پێشەوا بوخاری)، و هی تریش، هەروەها (ئیبن عوبەید)، و (ئیبن حەزم)، و زانای دیکەیش.... بێژەی (البَتَّة)یان، لە ناو دەستەواژەی فەرموودەکەدا، بە (لاواز) داناوە، و ئەوەیشیان ڕوونکردووەتەوە، کە گێڕەرەوەکانیان نەناسراون، و ئاستی دادگەری و لەبەرکردنیان نادیارە.[1]

ـ پاشان لە پەرتووکی (إغاثة اللهفان)دا، هاتووە، کە دەڵێت: ئەم فەرموودەیە (صەحیح) نییە، و (أبو الفرج الجوزي)، لە پەرتووکەکەیدا (العِلَل)، دەڵێت: (پێشەوا ئەحمەد)،(ڕەحمەتی خوای لیّ بێت)، فەرموویەتی: ئەم فەرموودەیە فەرموودەیەکە جێگیر نەبووە، و (خیلال) کە زانایەکە، و ئەویش پەرتووکێکی هەیە، بە ناوی (العِلَل) و لە هەمان پەرتووکدا، لە (ئەثرەم)ەوە، گێڕاویەتییەوە، و دەڵێت: فەرموودەکەی (ڕەکانە)م، گوت، بە (ئەبو عەبدوڵلا)، کە دەستەواژەی (البَتَّة: بە یەکجار)ی، تیادا بوو، ئەویش بە لاوازی دانا.[2]

ـ پاشان لە پەرتووکی (زاد المعاد)یشدا، هاتووە، کە دەڵێت: (پێشەوا بوخاری)، (ڕەحمەتی خوای لیّ بێت)، لەم فەرموودەیەدا، شلەقاوی و ناجێگیری ئاشکرا کردووە، و شایەتی لەسەر داوە، و (پێشەوا ئەحمەد)، (ڕەحمەتی خوای لیّ بێت)، فەرموویەتی: سەرجەمی ڕێگاکانی گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیە لاوازن، و لە پەرتووکی (موسنەدی پێشەوا ئەحمەد)دا،[3]

---

[1] مَجموع الفتاوى، لإبن تيمية، ب١٥، ل٣٣.

[2] إغاثة اللهفان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٣٢٣.

[3] بە ژمارە (٢٣٨٧).

هاتووە، لە (ئیبن عەبباس)ـەوە، کە گێڕاویەتییەوە، کە (ڕوکانەی کوڕی عەبد یەزید)، برای موتەلیب، ژنەکەی بە تەلاٚقی سێ بە سێ، و لە یەك (کۆڕ: مَجلِس)دا، تەلاٚق دا، جا دواتر زۆر غەمبار بوو بۆی، و ئۆقرەی بۆی نەما، جا پێغەمبەر، (صلی الله علیه وسلم)، پرسیاری لێکرد، کە چۆن تەلاٚقت دا؟ لە وەلاٚمدا گوتی: (سێ بە سێ) تەلاٚقم دا، پاشان پرسیاری تری لێ کرد، و فەرمووی: لە یەك (کۆڕ: مَجلِس)دا؟ گوتی: بەڵێ، جا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: دەی ئەوە یەك تەلاٚقە، ئەگەر حەز دەکەیت بیگێڕەرەوە ژێر نیکاحی خۆت، ڕوکانە دەڵێت: ئیتر گێڕامەوە لای خۆم، و لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ئەگەر ئارەزوو دەکەیت، بیگێڕەوە لای خۆت، ئیتر (ڕوکانە) گێڕایەوە لای خۆی.[1]

سەرەڕای هەموو ئەمانەیش، بێگومان خەڵکی شاری (مەدینە)، تەلاٚقی سێ بە سێ یان، بە (البَتَّة: بڕاوە، و یەکجاریی)، ناوزەد کردبوو، لەسەر ئەم بنەمایە بێت، فەرموودەکەی (ڕوکانە) مانای ئەوە ناگەیەنێت، کە تەلاٚقی سێ بە سێ، بە یەکجار، هەر سێ تەلاٚقەکەی پێ بکەوێت.

٢. <u>فەرموودەکەی ئیبن عومەریش نابێتە بەڵگە</u>: چونکە ئەو زیادەیەی کە جەماوەری زانایان دەیکەنە بەڵگە لەسەر کەوتنی سێ تەلاٚقە بەیەکجار، هیچ یەکێك لە زانایانی متمانە پێکراو زانیاری لەم جۆرەی نەگێڕاوەتەوە.

ـ لە ڕێگەی مالیك و ئەویش لە نافیع و ئەویش لە عەبدوڵلاٚی کوڕی عومەرەوە گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی کرد و فەرمووی: پێی بڵێ با ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆ ژێر نیکاحی خۆی، ئینجا بیهێڵێتەوە لەلای خۆی تا لە بێنوێژی پاك دەبێتەوە و جارێکی تر دەکەوێتەوە بێنوێژی و دیسان پاك دەبێتەوە، ئیتر لەوەو دوا ئەگەر ئارەزوو دەکات لەلای

---

[1] زاد المعاد، لابن القیم، ب٤، ل٥٩.

خۆی رابگرێ و ژنی خۆیەتی، ئەگەر ئارەزوویش دەکات بەرلەوەی کە بچێتە لای، تەڵاقی بدات، ئەمە ئەو عیددەیەیە کە خوای پەروەردگار فەرمانی کردووە کە ژنی تیادا تەڵاق بدرێت.

- لە رێگای ئەنەسی کوڕی سیرینەوە گێڕدراوەتەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ژنەکەی تەڵاق دا، جا پێشەوا عومەری باوکی ئەم حاڵەی بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) باس کرد، ئەویش فەرمووی: با ژنەکەی بگێڕێتەوە ژێر نیکاحی خۆی، جا پێشەوا عومەر دەڵێت: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەو تەڵاقەی لەسەر هەژمار دەکرێت و دەبێت پێوەی پابەند بێت؟ جا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەوەڵامیدا فەرمووی: ئەی چۆن؟ واتە جا چۆن دەبێت، ئەگەر تەڵاقەکەی لەسەر هەژمار نەکرێت.[1]

- پاشان لە رێگای ئیبن جوبەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی کردووە بە گێڕاندنەوەی ژنەکە بۆ ژێر نیکاحی ئیبن عومەر، جا لێرەدا پێشەوا عومەر پرسیاری کرد و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تەڵاقەکەی لەسەر هەژمار دەکرێت؟ ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی: تۆ بێژی دەستەوسان و کەودەن بێت، واتە خۆ نە منداڵە و نە شێتە، تا تەڵاقی نەکەوێت و لەسەری هەژمار نەکرێت.[2]

هەر بەم شێوازەیش لە سەرجەمی رێگا صەحیحەکانی ترەوە ئەم زیادەیەی تێدا نییە کە دەڵێت: (أرأیت لو طلقتها ثلاثاً)، ئەی ئەگەر هەرسێ تەڵاقەی

---

[1] عمدة القاريء بشرح صحيح البخاري، ب٢٠، ل٢٢٨.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو، (عمدة القاريء بشرح صحيح البخاري، ب٢٠، ل٢٢٨).

دابێت چۆنە؟ کە هەر ئەم زیادەیشە جەماوەری زانایان کردوویانەتە بەڵگە.[1]
پاشان لە ڕشتەی ئەم فەرموودەیەدا (شعیب ابن ذریعة) هەیە کە لاوازە و سەبارەت بە (معلی ابن منصور)یش، ئیمام ئەحمەد فەرموویەتی: کابراسەکی درۆزنە و (عطاء الخرسانی)یش، هەر لاوازە.

٣- **هیچ بەڵگەیەکیش لە فەرموودەکەی عوبادەی کوڕی صامتدا نییە**: چونکە گێڕەرەوەکانی نەناسراون، یان لاوازن:
- پێشەوا ئیبن قەیمی جەوزی دەفەرموێت: پاشان سەبارەت بە بەڵگەهێنانەوەتان بە فەرموودەکەی عوبادەی کوڕی صامیت کە (عبدالرزاق) گێڕاویەتییەوە، بەڕاستی ئەوە هەواڵێکە لەوپەڕی تێکشکان و بێبایەخیدایە، چونکە لە ڕێگا و ڕشتەی گێڕانەوەکەیدا (یەحیای کوڕی عەلاء) هەیە، ئەویش لە (عوبێدوڵڵای کوڕی وەلیدی وەصافی) و ئەویش لە (ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڵڵا)وە کە تا ئێرە ڕشتەکەی لاوازە، ئینجا ئەمانیش لە (مالیك)ـەوە، گێڕاویانەتەوە و مالیکیش لە کابرایەکی نەناسراوەوە و پاشان بەڵگەی تریش لەسەر درۆیی و بەتاڵی ئەم گێڕانەوەیە ئەوەیە کە لە هیچ شوێنەوارێکی نە صەحیح و نە ناساغ و نە پەیوەست (متصل) و نەپچڕاودا ئەوە نەهاتووە، کە تەنانەت باس لە مسوڵمانێتی باوکی عوبادەی کوڕی صامیتیش بکات چ جای باوای!! کە ئەمەیش بێگومان کارێکی مەحاڵە.[2]

٤- **بە بەڵگەکردنی فەرموودەکەی عوەیمری عەجلانی کارێکی دروست نییە**: چونکە ئەوەی کە ئەم فەرموودەیە دەکاتە بەڵگەی دەستی،

---

[1] بۆ درێژە باسی ئەم پرسە و ئاگاداربوون بەسەر سەرجەمی گێڕانەوەکانی فەرموودەکەی ئیبن عومەردا تەماشای پەرتووکی (عمده القاریٔ)، بەشی تەلاّق بکە.

[2] زاد المعاد في هدى خير العباد، للإمام ابن القيم الجوزية، ب٤، ل٥٩٤.

ئەگەر لەوانەبێت، کە دەڵێت: هەر کەسێك لە دوای نەفرینکاری بەس مێردەکە بۆ ژنەکەی راستەوخۆ جیابوونەوە لە نێوانیاندا روو دەدات، هەروەك ئەمە لە مەزهەبی ئیمامی شافیعیدا هەیە، یاخود لە دوای کەسێك لە پرۆسەی نەفرینکاری (مُلاعنـة)ی نێوان هەردووکیان، جیابوونەوەکە روو دەدات، هەروەك ئەمە یەکێکە لەو گێڕانەوانەی کە لە پێشەوا ئەحمەدەوە گوازراوەتەوە جا بە بەڵگەکردنی ئەم فەرموودەیە بەتاڵە و بێ بنەمایە، چونکە لەم کات و حاڵەتەدا تەڵاقەکە پوچەڵە (لَغو)ە، ئیتر چۆن شتی پوچ دەکرێتە بەڵگە.

ـ پێشەوا رازی جەصاص (رەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: بۆ شافیعییەکان دروست نییە کە ئەم فەرموودەیە بکەنە بەڵگە بۆ خۆیان، چونکە لە مزەهەبەکەیاندا ئەم زانیارییە هەیە کە دەڵێت: جیابوونەوەی نێوان ژن و مێردەکە هەر لە دوای نەفرینکاری پیاوەکە، لەپێش نەفرینکاری کردنی ژنەکە روو دەدات، ژنەکە دەبێتە (بائنة) بێگانە لێی، ئیتر تەڵاقی ناخرێتە شوێن، جا ئیتر چۆن نکوڵی لە تەڵاقێك دەکرێت کە نەکەوتووە و حوکمەکەی نەچەسپاوە؟[1]

ـ زانای مەزن ئیبن قودامەی مەقدیسی دەفەرموێت سەبارەت بە فەرموودەی نەفرینکاری دوو لایەنە (الملاعنة) لە نێوان هەردوو پیاو و ژنەکەدا ئەم فەرموودەیە هیچ بڕیارێك پابەند ناکات، چونکە ئەو جیابوونەوەیە بەهۆی تەڵاقەکەوە نەهاتووتە دی، بەڵکو تەنها و تەنها بە کردنی ئەو نەفرینکارییە روویداوە، لەلای پێشەوا شافیعی ئەو جیابوونەوەیە تەنها بە نەفرینکاری کردنی پیاوەکە روویداوە، دەی کەواتە دواجار ناکرێتە بەڵگە.[2]

---

[1] تەماشای (أحکام القرآن)ی، پێشەوا رازی جەصاص بکە بەرگی دووەم لاپەڕە ٨٠ ـ ٨١.

[2] المغني والشرح الکبیر، ب٨، ل٢٤٢.

هەروەها لەلایەکی تریشەوە ئەم فەرموودەیە بۆ بە بەڵگەکردن ناشێت، لەلای ئەوانەی کە بە مەرجیان گرتووە، کە جیابوونەوە لە پرۆسەی نەفرینکاریدا دەبێت، لە لای (دادوەر) بکرێت، چونکە ئەم گرێبەستی هاوسەرگیرییە هیچ دەرفەتێکی بەردەوام بوونی تیادا نەماوە، پێویستە لابرێت و هەڵوەشێنرێتەوە و بۆ هەتا هەتایە لە پیاوەکەی یاساغ (حەرام) دەبێت، ئەمەیش رای لەپێشتر (راجیح)ە، بەبەڵگەی فەرموودەی، (المتلاعنان لا يجتمعان أبداً)، ژن و پیاوی نەفرینکار لە یەکتر هەرگیزاو هەرگیز ئیتر لە یەکتری کۆناکرێنەوە.[1]
پاشان سەبارەت بە تەڵاقی سێ بە سێ لە لایەن نەفرینکارەوە ئەمە بۆ دڵنیایی بوونە لە رازی بوونی ئەو کەسە بەو حەرامبوونەی کە بە هۆی پرۆسەی نەفرینکارییەکەوە هاتۆتە دی و ژنەکەی لێ یاساغ بووە.
- دیسان ئیبن قودامە دەڵێت: پرۆسەی نەفرینکاری لە یەکتر حەرامبوونێکی هەتاهەتایی دەهێنێتە ئاراوە، بۆیە تەڵاقدان لە دوای نەفرینکاریی وەك تەڵاقی دوای هەڵوەشانەوەی گرێبەستی هاوسەرێتی وایە واتە بێ مانایە.[2]
- پێشەوا ئیبن قەییمی جەوزی دەفەرموێت: سەبارەت بە بەڵگە هێنانەوەتان بەوەی کە کابرای نەفرینکار ژنەکەی سێ بە سێ تەڵاق داوە، لە خزمەت پێغەمبەر دا (صلى الله عليه وسلم) و بە ئامادەبوونی ئەو زاتە، ئەم فەرموودەیە صەحیح نییە، ئاااااای .... چەندە دوریشە لە بە بەڵگەکردنی ئەم فەرموودەیەدا، بۆ ئەوەی کە خستنی سێ تەڵاقە بە یەکجار و بە یەك وشە دروست بێت، بخرێت، پاشان بە بەڵگەکردنی ئەم فەرموودەیە بۆ ئەو کەسانەی کە پێیان وایە جیابوونەوە لە دوای نەفرینکردنی تەنیا پیاوەکە روو دەدات، هەروەك پێشەوا شافیعی فەرموویەتی و یاخود لە دوای نەفرینکاری هەردوو ژن و پیاوەکە، جا جیابوونەوە روو دەدات، هەرچەندە دادوەریش جیای

---

[1] نيل الاوطار، ب٦، ل٢٤٢.

[2] المغني والشرح الكبير.

نەکردبنەوە، وەك پێشەوا ئەحمەد لە یەکێك لە گێڕانەوەکانیدا فەرموویەتی، جا بە بەڵگەکردنی ئەمانە بۆ فەرموودەکە و بۆ ئەو گرووپانەی کە ئەمە ڕایانە، بەتاڵ و بێ بنەمایە، چونکە لەو تەلاَقی سێ بەسێیە لەم حاڵەتەدا پوچ و پشتگوێخراوە و هیچ سوودێکی نییە، هەروەها لەلای ئەوانەیش کە جیابوونەوەکە دەبەستنەوە بەوەی کە لەلای دادوەر کرابێت، هەربۆیان نییە بیکەنە بەڵگە، چونکە ئەم گرێبەستی هاوسەرێتییە هیچ دەرفەت و ڕێگایەك بۆ مانەوەی و بەردەوام بوونی نەماوەتەوە و بەڵکو پێویستە کۆتایی پێ بهێنرێت و هەڵبوەشێنرێتەوە و بۆ هەتاهەتایی ژنەکەی لەسەر یاساغ بووە و تەلاَقی سێ بە سێیەکەیشی تەنها بۆ جەختکردنەوەیە لەسەر ئامانج و مەبەستی پرۆسەی نەفرینکاری (اللّعان) و چەسپێنەرێتی.[1]

٥. سەبارەت بە فەرموودەکەی عائیشەخانی دایکیشمان (ڕەزای خوای لێ بێت): لە ڕاستییدا ئەم فەرموودەیە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە تەلاَقی سێ بە سێ هەر سیانی بە یەکجار پێکەوە دەکەوێت، بەڵکو ئەو مانایەی کە ئەم فەرموودەیە دەیدات بە دەستەوە ئەوەیە کە ئەو ژنە مێردەکەی هەر سێ تەلاَقەی داوە، مانای ئەم گوفتارەش ڕوون و ئاشکرایە، بەوەی کە تەلاَقی شەرعی ئەوەیە کە جار لە دوای جار بێت، بەبەڵگەی ئەوەی کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نکوڵی لێ نەکردووە و بەرپەرچی نەداوەتەوە.

- زانای پایەبەرز ئیبن قەیمی جەوزی دەفەرموێت: کوا لە کوێی فەرموودەکەدا ئەوە هاتووە کە کابرا ژنەکەی بەیەك دەربڕین و لەیەك کاتدا سێ تەلاَقەی داوە؟ بەڵکو ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە بەدەست ئێمەوە، چونکە کاتێك دەگوترێت کە فلاَنە کەس سێ جار ئەو کارەی کردووە یان سێ جار گوتی و دەری بڕی کە ئەو کارەی جار لە دوای جار کردبێت، یان جار لە دوای جار دەری بڕیبێت، هەر مانایەکی لەم جۆرەش چ لە زمانی عەرەب و چ لە زمانی

---

[1] زاد المعاد، دانانی پێشەوا ئیبن قەیمی جەوزی، ب٤، ل٥٨.

غەیری عەرەبەکاندا ڕێگای تێ دەچێت، هەروەك دەگوترێت: (قذفه ثلاثا) سێ تۆمەتی دایە پاڵ، واتە تۆمەتێك و پاشان تۆمەتێکی تر و پاشان تۆمەتی سێیەمی ئاراستە کرد. یان دەوترێت (وشتمه ثلاثا) سێ جنێوی پێدا، یان دەگوترێت (وسلّم عليه ثلاثا) سێ جار سلاوی لێ کرد، واتە سلاوێکی لێ کرد و دواتر سلاوی دووەم و پاشان سلاوی سێیەمی لێکرد.[1]

- پێشەوا ئیبن حەجەری عەسقەلانی، لە پەرتووکە مەزنەکەیدا (فتح الباری) دەفەرموێت: دەگونجێت مەبەستی ئەوە بێت کە بەجۆرێك ژنەکەی تەڵاقداوە، کە دابڕانە و جیابوونەوەی تەواوی لێ هاتبێتە دی و ژنەکەی لە کۆڵ بوویێتەوە، ئەمەیش گشتی ترە لەوەی کە تەڵاقی سێ بە سێی دابێت، پێکەوە یان بە جیا، ئەو زانیارییانەی کە دواتر لە پەرتووکی (الأدب)ی (فتح الباری)دا دێن پشتگیری لەم دووەمە دەکەن و لە ڕوویەکی ترەوە ژنەکە دەڵێت کابرای دووەجار کە شووم پێکردو تەڵاقی دامەوە، بە سێ تەڵاقە تەڵاقی دام.[2]

**<u>٦. فەرموودەکەی (مەحمودی کوڕی لەبید) بەڵگە نییە بۆیان، بەڵکو بەڵگەیە بەسەریانەوە:</u>** ئەم فەرموودەیە بە بەڵگە دادەنرێت لەسەر نادروستی کۆکردنەوەی سێ تەڵاقە پێکەوە و بە یەکجار و نابێتە پاڵپشت بۆ ئەوانەی کە دەڵێن دروستە سێ تەڵاقە پێکەوە و بەیەکجار بخرێت، چونکە هەرگیز ناچێتە عەقڵەوە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دان بە کردارێکدا بنێت کە گەمەپێکردن و گاڵتەجاڕی بێت، بە قورئانی پیرۆز.

- لە پەرتووکی (إغاثة اللهفان)دا، هاتووە، کە دەفەرموێت: بە بەڵگەکردنی ئەم فەرموودەیە لەسەر ئەوەی کە خستنی سێ تەڵاقە پێکەوە دروست بێت،

---

[1] زاد المعاد في هدي خير العباد، ب٤، ل٥٩.

[2] فتح الباري بشرح صحيح البخاري، ب٩، ل٣٨٧.

لەڕاستییدا پێچەوانەکردنەوەی راستییەکانە و زیاتر بەڵگەیە لەسەر حەرامێتی ئەم کارە نەوەك لەسەر حەڵاڵبوونی و کردنیشی بە بەڵگەی ئەوەی کە مانای کەوتنی تەڵاقەکە دەدات بەدەستەوە، ئەمیش کارکردنە بە هەواڵدان بە شتەکان پێش رووداانیان و خەملاندنیان، بەلاّم بابای لاسایی کەرەوە (المقلّد)، چ دەربایسە کە چیی روو دەدات، ئەو تەنها سەرخستنی مەزهەبەکەی خۆی لامەبەستە و تەواو، یاخود چ دەربایسە لەوەی کە چۆن گومانێك بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەبرێت، بەوەی کە گوایە رێگای داوە بە گاڵتەجاڕی کردن بە فەرمایشتی پەروەردگار، کە قورئانە و ئەم گاڵتەپێکردنەیشی (حاشا) بە دروست زانیوە و دواجار بابای لاسایی کەرەوە وا دەزانێت یاخود وا حاڵیی کراوە کە ئەمە لە شەرعەکەی پێغەمبەردایە، (صلى الله عليه وسلم) و بڕیاری ئەو زاتەی لەسەرە، بۆیە جێبەجێی کردووە،[1] سەرەڕای ئەمە هەموویش ئەم فەرموودەیە تانە لێدراوە.

- پێشەوا ئیبن حەجەری عەسقەلانی دەفەرموێت: مەحموودی کوڕی لەبید لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) لە دایك بووە، بەلاّم ئەو زانیارییە نەچەسپاوە، کە فەرموودەی لە خودی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بیبیستبێت، هەرچەندە کە هەندێك لە هاوەڵان باسیان کردووە، لەبەرئەوە بووە کە پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) دیوە، جا پێشەوا نەسائی لە دوای تەخریجکردنی فەرموودەکە دەفەرموێت: ئاگادار نیم، کە هیچ کەس ئەم فەرموودەیەی گێڕابێتەوە، جگە لە (مەخرەمەی کوڕی بەکیر) لە باوکییەوە..... هەروەها گوتراویشە کە لە باوکیشیەوە نەیبیستووە، دواتر پێشەوا عەسقەلانی بەردەوام دەبێت، لە فەرمایشتەکەی و دەفەرموێت: ئەگەر وا دابنێین کە فەرموودەکەی مەحموودی کوڕی لەبیدیش صەحیحە، ئەوا هەر هیچ روونکردنەوەیەکی تێدا نییە. سەبارەت بەوەی کە ئایا کەوتنی هەرسێ

---

[1] إغاثة اللهفان، ب١، ل٣٣٢.

تەڵاقەکەی بەسەردا چەسپاند لەگەڵ نکوڵی لێکردنیان پێکەوە و بەرپەرچدانەوەیان.. یان نا... ؟![1]

**٧ـ فەرموودەکەی فاطیمەی کچی قەیس، هیچ جۆرە ڕشتە (سند)ێکی نییە**، چونکە تەڵاقدانەکەی بە تەنها دەربڕینێك (لفظ)ێك نەبوو، بەڵکو بەو شێوازەی کە دروستە دابەشکرا بوو بۆ چەند جارێکی جیاواز لە یەکتری و پرسیارکردنیش لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سەبارەت بە دابینکردنی بژێوی ژیان بۆی و هەروەها جێگای نیشتەجێبوون لە دوای تەڵاقدانی جاری سێیەم بوو، پاشان ئەم فەرموودەیە پێشەوا موسلیم لە پەرتووکە صەحیحەکەیدا لە ئەم ناونیشانەدا هێناویەتی (المطلقة البائن، لا نفقة لها) ئەو ژنەی کە تەڵاقدراوە و تەڵاقەکەی کەوتووە، بژێوی بۆ دابینکردنی لەسەر مێردەکەی نییە. کە نزیکەی بیست گێڕانەوەی ڕشتەی بەهێزی لەم بارەیەوە هێناوە و هەروەها پێشەوا ئەبو داود لە پەرتووکەکەیدا (سنن أبي داود) لە ژێر ناونیشانی (النفقة المثبوتة) بژێوی ژنێك کە بە یەکجارەکی تەڵاقی کەوتبێت. نزیکەی دە گێڕانەوەی ڕشتە بەهێزی هێناوە، ئینجا سەرەڕای ئەو گشت گێڕانەوانەی کە هەردوو پێشەواکەی فەرموودە لە بەشە باشەکانی تردا گێڕاویانەتەوە، هەروەها وەك ئەوەی کە پێشەوا بوخاری لەم بارەیەوە هێناویەتی، هەروەك نەریتی خۆیشی دابەشی کردووە بەسەر پەرتووکە جیاوازەکانی فیقهدا و پوختەی دەربڕینی ئەم دەستەواژەگەلە گێڕانەوەکانی پێشەوایان موسلیم و بوخاری و ئەبوداوددا بەم شێوازەی لای خوارەوەیە:

أ. إنَّ زوج فاطمة طلَّقها .... فذهبت إلى رسول الله (صلى الله عليه وسلم) . واتە: مێردەکەی فاطیمەخان هەڵسا فاطیمەی تەڵاقدا.... و پاشان چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) .

---

[1] پەرتووکی فتح الباري، ب٩، ل٣٦٢.

ب . إنَّ زوجها طلَّقها، فبتَّ طلاقها.... واتە پیاوەکەی فاطیمە فاطیمەی تەڵاق دا بە تەڵاقدانی تەواوەتی.

ت . إنَّ زوجها طلَّقها البَتَّةَ. مێردەکەی خاتوو فاطیمەی بە یەکجارەکی و بڕاوەیی تەڵاق دا.

ث . لإنَّ زوجها طلَّقها ثلاثا. پیاوەکەی خاتوو فاطیمە، هەڵسا بە تەڵاقی سێ بەسێ فاطیمەخانی تەڵاق دا.

ج . إنَّ زوجها طلَّقها آخر ثلاث تطليقات. عەمری کوڕی حەفصی مەخزومی کە مێردی فاطیمە خان بوو، خاتوو فاطیمەی تەڵاقدا بە سێ تەڵاقەی کۆتایی و دواجار.

ح . إنَّ زوجها بعث إليها بتطليقة كانت باقية لها. مێردەکەی ئەو تەڵاقەیشیدا کە مابوویەوە.

لە دەربڕینێکی صەحیحدا هاتووە کە مێردەکەی تەڵاقیی دا بە تەڵاقدانی کۆتایی و هەر سێ تەڵاقەکە، و ڕشتە (سند)ـەکەیشی صەحیحە.

جا ئەم گێڕانەوەیە ڕەهەندە شاراوە و گشتییەکانی فەرموودەی (طلَّقها ثلاثا) سێ تەڵاقەی دا ڕاڤە و شرۆڤە دەکات، بەم پێیە بێت فەرموودەکە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە هەر سێ تەڵاقەکەی ژنەکەی پێکەوە دابێت.[1]

---

[1] بۆ درێژە باسی ئەم پرسە، تەماشای ئەم ژێدەرانە بکە: فتح الباري بشرح صحيح البخاري، باسی چیرۆکەکەی فاطیمەی کچی قەیس. ب٩، ل٤٧٧ ـ ٤٧٨. پەرتووکی زاد المعاد في هدي خير العباد، پێشەوا ئیبن قەیمی جەوزی، ب٤، ل٥٩. پەرتووکی إغاثة اللهفان، ب١، ل٢٢٢، إعلام الموقعين، ب٣، ل٥١. کە ئەم دوو پەرتووکەش هەر نووسراوی پێشەوا ئیبن قەیمی جەوزین، هەروەها تەماشای پەرتووکی: الطلاق في الإسلام، محدود و مقيد، كمال أحمد عون، ل٥١ بکە.

**٨ـــ توێژینـــەوەی فەتواکـــەی عەبـــدوڵڵای کـــوڕی عـــەبباس و شرۆڤەکردنی گێڕانەوەکەی:** تێبینی و زانیاری گەلێك هەن، کە لە کاتی کارکردنمان بە فەتواکەی ئیبن عەباس و شرۆڤەکردنی گێڕانەوەیدا هاوکارمان دەکەن بۆ سڕینەوەی گرفت و ناکۆکییەکانی نێوان ئەم دووانە و لە گرنگترین ئەم تێبینییانەش ئەمانەی لای خوارەوەن:

**یەکـەم: کـارکردن بـە فەتواکـەی ئـیبن عـەبباس و پشتگوێخسـتنی گێڕانەوەکەی:**

پێشتر ڕوونمان کردەوە کە جەماوەری زانایان کاریان بە ڕووکەشی گێڕانەوەکەی ئیبن عەبباس نەکردووە، بەوەی کە سێ تەڵاقە لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بەیەك تەڵاق هـەژمار دەکـرا، هـەروەها لەسـەردەمی پێشـەوا ئەبوبەکریشدا هەروابوو، هەروەها لـە دوو سـاڵی فەرمانڕەوایـەتی پێشـەوا عومەریشدا هەروابوو، بەڵکو کار بەو فەتوایە دەکەن، کە بۆ کابرایـەکی دا کە ژنەکەی بە سێ تەڵاقە تەڵاق دابوو، لەوەڵامیدا فـەرمووی: تـۆ لـە خـوا نەترساوی، بۆیە هیچ دەروازەیەك شك نابەم بـۆ ڕزگاربوونـت لـەم قەیرانـە، سەرپێچی پەروەردگاری مەزنت کـردووە و ژنەکـەتت لـێ بووەتـە بێگانـە و تەڵاقی کەوتووە واتە بە (البینونة الکبری) تەڵاق کەوتنی بڕاوەیی و کۆتایی، بە بەڵگەی ئەم بڕگەیەی فەرمایشتەکەی کە گوتی: (فلا أجد لـك مخرجـا)، هیچ دەروازەیەك شك نابەم بۆ دەربازبوونت لەم لەمپەرانـە، جـا گوێڕایـەڵی کردنی فەرمایشتی ئەم شەرعزانانە بە ڕێبـازی کـارکردن بـە فەتواکـەی و پشتگوێخسـتنی گێڕانەوەکـەی لـەم پرسـەدا، زۆر بـە ڕاشـکاوی پێچـەوانە دەبێتەوە لەگەڵ ئەو تێڕوانینەی کە زانایانی زانستی ئوصولی فیقه لەسـەری پێکهاتوون کە دەفەرموون: دەبێت فەرمایشتی هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێت) پێش بخرێت بەسەر فەتواکاندا، لە حاڵەتی بەرپابوونی دژایەتی لە نێوان ئەم دووانەدا، بۆ نموونەیش ئیبن عەبباس لە فەرموودەکەی (بُرَیرَة)ەوە دەگێڕێتەوە

کە فرۆشتنی کەنیزەك تەڵاقدانی نییە، دواتریش فەتوانی بە جۆرێکی تر داوە و گوتوویەتی کە هەر فرۆشتنی تەڵاقدانیەتی. جا لەم پرسەدا زانایان گێڕانەوەکەیان وەرگرتووە و فەتواکەیان پشتگوێخستووە.[1]

هەر چوار پێشەواکە و زانای تریش ئەو گێڕانەوەیە، عائیشەخانی دایکمانیان وەرگرتووە کە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە شیری نیچرەکەیش حەرامە، واتە ئەو پیاوەی کە مێردی ژنە شیردەرەکەیە، بێگومان دانەپاڵی شیرەکە بۆ ئەم پیاوە لە ڕووی ناڕاستەوخۆ (مجاز)ییەوە، چونکە ئەو پیاوە هۆکار بووە بۆ هاتنی ئەو شیرە بێگومان گێڕانەوەی صەحیح لەبەردەستدا هەیە، خاتوو عائیشە خۆی پێچەوانەی ئەمە فەتوای داوە، ئەمیش ئەو ڕووداوەیە کە کابرایەك سەردانی عائیشەخانی دایکمانی کرد کە ئەو کابرایە خوشکەزاکانی شیریان پێدابوو، نەوەك براژنەکانی.[2]

پێشەوا ئیبن حەجەری عەسقەلانی دەفەرموێت: بەپێی فەتوای ئیبن عەبباس (خولع) کرینەوەی تەڵاق لە مێردەکە للایەن ژنەکەوە، پرۆسەی هەڵوەشاندنەوەیە، بەڵام بەپێی گێڕانەوەی هەر خودی ئیبن عەبباس (خولع) تەڵاقە، جا ئەگەر هاوەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەپێچەوانەی گێڕانەوەی خۆیەوە فەتوای دەرکرد، ئەوا ئەوەی کە گێڕاویەییەوە بایەخی هەیە و کاری پێ دەکرێت و فەتواکەی کاری پێ ناکرێت.[3]

هەروەها ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەو فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، کە ئەگەر سەگ دەمی خستە ناو قاپ و قاچاختانەوە ئەوا حەوت جار بیشۆن،[4]

---

[1] زاد المعاد، ب٤، ل٦٠. إعلام الموقعين، ب٣، ل٥١.

[2] فتح الباري شرح صحيح البخاري، ب٩، ل١٥٠.

[3] اعلام الموقعين، ب٣، ل٥١.

[4] تەواوی تێکستکی فەرموودەکە بەم شێوەیەیە: (قال رسول الله (صلى الله علية وسلم) : (طهور إناء أحدكم إذا ولغ فيه الكلب أن يغسله سبع مرّات، أولهن

کەچی بەپێچەوانەی ئەم گێڕانەوەیەوە فەتوای دەرکـردووە، بـەڵام جـەماوەری زانایان کاریان بە گێڕانەوەکەی کردووە.[1]

**دووەم: تـاوتوێکردن و توێژینـەوەی ڕای ئەوانـەی کـە بانگەشـەی سڕینەوە (النسخ) دەکەن، لە فەرموودەکەدا:**

ئەو قسەیەی کە دەڵێت: (کان الطلاق الثلاث واحـدة) سـێ تەڵاقـە بەیـەك تەڵاق هەژمار دەکرا. کار بە ناوەڕۆکەکـەی دەکـرا، لەسـەردەمی پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم) و پێشەوا ئەبوبەکر و دوو سـاڵی فـەرمانڕەوایی پێشـەوا عومەردا، ئەمـە دواتـر نەسـخ کراوەتـەوە و کـارکردن پێـی شـۆرراوەتەوە، لەراستیدا ئەم قسەیە پووچ و بەرپەرچدراوەتەوە، لەبەر ئەم فاکتەرانـەی لای خوارەوە:

١. ئەو یاسا و ڕێسا گشتییەی کە سەراپای گەلی ئیسـلام لەسـەری کـۆك و تەبان ئەوەیە کە دەقی قورئانی پیرۆز و دەقی سوننەتی پێغەمبـەری دڵسـۆز (صلی الله علیه وسلم) تەنها دەق دەتوانێت ناوەڕۆکەکـەی بشـواتەوە و نەسـخی بکاتەوە، هەروەها سەردەمی هەموارکردنەوەی دەق و بڕیارەکانی شـەریعەتی ئیسلامیش بە کۆچی دوایی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کۆتایی هاتووە.

٢. پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) هیچ دەقێکی نەسـخ نەکردووەتەوە، ئاکاری لەم جۆرە گەلێك دوورە لەم زاتـەوە، کـە سـوننەتێکی چەسپاو بە تەنها ڕای تایبەتی خۆی نەسخ بکاتەوە، ئەگەر کاری وای ئـەنجام

---

بالتراب). ئەگەر سەگ دەمی خستە ناو قـاپو قاچـاخی هەرکەسێکتانەوە، بـا حەوت جار بیشتوات بە ئاو، جاری یەکەمی بە گڵ بێت، ئیتر پـاك دەبێتـەوە. پێشەوا موسلیم لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی، بڕوانە پەرتووکی (سبل اسلام) ب١، ل٢٨.

[1] سەرچاوەی پێشوو (اعلام الموقعین).

بدایـــە و نەســـخی بکردایەتـــەوە ئـــەوا هـــاوەڵان (ڕەزای خوایـــان لـــێ بێـــت) دەستپێشخەرییان دەکرد و بەرپەرچیان دەدایـەوە و نکوڵییـان لـە کارەکـەی دەکرد و کاری لەم جۆرەیش دوورە لە هاوەڵانەوە کە عومەر (ڕەزای خـوای لـێ بێـت) خوانەخواستە کاری لەم جۆرە بکات و ئەوانیش خوانەخواستە ملی بـۆ کەچ بکەن!

٣. ئەگەر ئەو نەسخبوونەوەیە لەسەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليـه وسـلم) ڕوویداوە، جا چۆن دروستە بۆ ئیبن عەباسی گێڕەرەوەکەی کە هەوڵ بدات بـە مانەوەی ئەو حوکمـە لەســەردەمی جێنشـینایەتی ئەبوبـەکر و هەنـدێ لـە جێنشینایەتی پێشەوا عومەردا، (ڕەزای خوا لە هەموویان بێت).

٤. ئەگەر بگوترێت کە ئەم گێڕانەوەیە بە کۆڕا (اجماع)ـی، هـاوەڵان نەسـخ بووەتەوە، باشە! ئەم قسەیە وەردەگیرێت، ئەگەر هاتوو بوونی ئیجماع هەبوو، لەسەر چەسپاندنی دەقە نەسخکەرەوەکە، بەڵام ئەی کوا؟ ئەو ئیجماعـە لـە کوێدایە؟ هەروەها ئەو دەقە کوا؟ کە بانگەشەی بـۆ دەکرێـت، کـە هەیـە؟! پاشان سەبارەت بەوەی کە هەر خۆیان لـە خۆیانـەوە نەسـخیان کردبێتـەوە، حوکمەکـەیان شـۆردبێتەوە پەنابـەخوا لـەکاری لـەم جـۆرە چـونکە ئەمـە کۆبوونەوە و ئیجماع کردنە لەسەر هەڵە، ئـەوانیش دوورن و پـارێزراون لـە کاروباری نابەجێی لەو جۆرە.

٥. ئەگەر گوترێت کە لەوانەیە نەسخکەرەوەکە پێشتر شاراوەبووبێت و دواتـر لەســەردەمی پێشـەوا عومــەردا دەرکـەوتبێت، ئـەوا ئـەم رایـەش هـەر بەرپەرچدەدرێتەوە چونکە ئەمەیش دیسان هەر بە هەڵـە ئـەژمار دەکرێـت، چونکە ئەمە چەسپاندنی ئەو راستییەیە کە هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێت) لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی پێشەوا ئەبوبەکر و دوو ساڵی فەرمانڕەوایەتی پێشەوا عومەردا لەسەر هەڵە کۆبوونەتـەوە و ئیجماعیـان لەسـەری کـردووە، دوای ئەمەیش جا چۆن دەکرێـت کـە هەریەکـە لـە سـڕیار (الناسـخ) و سـڕراوە

(المنسوخ)، بەو بەردەوامییە شاراوە بن لە گەلی ئیسلام، هەم لە سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هەم لە سەردەمی جێنشینایەتی ئەبوبەکر و ماوەیەکیش لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی پێشەوا عومەردا؟ بەشێوەیەکی تایبەتیش لە پرسێکی ترسناکی پەیوەندیداری راستەوخۆ بەحەلاڵی و حەرامی شەرەف و ناموسی خەڵکەوە هەیە.

٦. دانەنان بەنەسخ لێرەدا بە روونی و بە تەواوی دژایەتی دروست دەکات، لەگەڵ فەرمایشتەکەی پێشەوا عومەری کوڕی خەتابدا (ڕەزای خوای لێ بێت) کە دەفەرموێت: (إن الناس قد استعجلوا في شيء كانت لهم فيه أناة)، واتە: بە ڕاستی خەڵکی لەم پرسەدا سەریان تێکردووە و زۆر بە پەلەن لەکاتێکدا کە دەبوو تیایدا زۆر شێنەیی و پشوودرێژ و لەسەرخۆ بن. سێ تەلاقە بەیەکەوە نەخەن و بەڵکو قۆناغ بە قۆناغ و یەك یەك بیخەن. دەی ئایا گەلی ئیسلام دەبێت لەسەرخۆو شێنەیی بن لە بڕیارێکدا کە نەسخ کرابێتەوە؟ سەرەڕای ئەمەیش رووکەشی فەرموودەکە مانای ئەوە دەدات بەدەستەوە کە پرۆسەی گۆڕاندنی حوکمەکە لەلایەن خودی پێشەوا عومەرەوە ئەنجامدراوە، ئەمەیش وەك سزایەکی تەمبێکارانە بۆ هەرکەسێك کە پەلە لە پرسێکدا دەکات، کە پەروەردگار بڕیاری داوە، بەشێنەیی و هێواش پراکتیزە بکرێت، پابەندیش بین بەو پشوودرێژی و شێنەیی بوونەوە تیایدا.[1]

**سێیەم: تاوتوێکردن و توێژینەوەی ئەو (تاویل) شرۆڤەی کە پێی وایە: (كان الثلاث واحدة) سێ بە یەك بووە:**

ڕاڤە و شرۆڤە کردنی ئەو فەرموودەیەی کە وا دەگەیەنێت تەلاقی سێ بە سێ یەك تەلاق بووە و هەر بەیەك دانەیش هەژمار دەکرا، بەوەی کە ئەو خەڵکە لەسەردەمی پێغەمبەر و (صلی الله علیه وسلم) پێشەوا ئەبوبەکر و دوو ساڵ لە سەردەمی جێنشینایەتی پێشەوا عومەردا، تەلاقی سێ بە سێیان

---

[1] بۆ درێژەباسی ئەم پرسە بڕوانە پەرتووکی (فتح الباري) ب٩، ل٣٦٤.

بەکارنەدەهێنا، بەڵکو ئەم دەستەواژەیە (أنتِ طالقٌ ثلاثاً) سێ بە سێ تەڵاقت کەوتبێت، لەسەردەمی پێشەوا عومەردا (ڕەزای خوای لێ بێت) داهێنرا و هاتە ئاراوە، و ئیتر ئەمیش وەك سزایەك لەسەریان بۆی هەژمار کـردن و پابەنـدی کردن بە قسەی خۆیانەوە، بەڕاستی ئەم شرۆڤەیە لێکدانەوەیـەکی دوورە لـە چەند ڕوویەکەوە، لەوانە:

١. ڕووکەشـی فەرموودەکـە لەگـەڵ ئـەم شـرۆڤەیەدا تێـك ناکاتـەوە و لـە مەرجەکانی تەئویلکردنیش ئەوەیە کە بە جۆرێك ئەو تەئویلـە بکرێـت کـە دەقەکە هەڵگری ئەو مانایە بێت.

٢. ئەم فەرموودەیە بە چەندەها گێڕانەوەی تر گێڕدراوەتەوە کە سەرجەمی ئەو گێڕانەوانە پێچەوانەن و دژایەتییان هەیە لەگەڵ تەئویلکردنەکەدا ، لەوانە:

أ. لە گێڕانەوەی پێشەوا موسلیم و غەیری ئەویشدا هاتووە، لە (طاوس)ـەوە، دەگێڕێتەوە کە ئەبو صەهباء بە عەبدوڵڵای کـوڕی عەبباسـی گـوت: ئایـا دەزانیت کە سێ تەڵاقە بە تەڵاقێك دادەنرا لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) و پێشەوا ئەبوبەکر و بە سێ تەڵاق هەژمار دەکرا لـە سـەردەمی پێشەوا عومەردا، جا ئیبن عەبباس لە وەڵامیدا فەرمووی: بەڵێ.[1]

جا لە ڕاستییدا دەستەواژەی (تجعل واحدة) بە یەك تەڵاق دادەنرا، پێچەوانەی ئەم تەئویلکردنەیە.

ب . لە ڕێگای موعەمەرو ئیبن جورەیجەوە هاتووە و ئەوانیش لە ئیبن طاوس و ئەویش لە باوکییەوە گێڕاویانەتەوە کە ئەبو صەهباء بە عەبـدوڵڵای کـوڕی عەبباسی گوت: ئایا نەتزانیوە کە سێ تەڵاقە بەیەك تەڵاق هەژمار دەکرا لە سـەردەمی پێغەمبـەری خـواوا (صـلى الله عليـه وسـلم) و لـە سـەردەمی جێنشـینایەتی پێشـەوا ئەبوبـەکرداو سـەرەتای فەرمانڕەوایـەتی پێشـەوا عومەردا؟ ئیبن عەبباسیش لە وەڵامدا فەرمووی: بەڵێ!

---

[1] مجموع الفتاوى، لشيخ الاسلام ابن تيمية، ب١٣، ل٢٣.

ئەم گێڕانەوەیە پێشەوا موسلیم لە پەڕتووکە صەحیحەکەیدا هێناویەتی. لە دەربڕینێکی تردا هاتووە کە دەڵێت: ئایا نەتزانیوە کە سێ تەڵاقە لەسەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) و جێنشینایەتی ئەبوبەکر و سەرەتای جێنشینایەتی پێشەوا عومەردا دەگێڕدرایەوە بۆ یەك تەڵاق؟ ئیبن عەباسیش لە وەڵامدا فەرمووی: بەڵێ.[1] دیسان ڕستەی (ترَد إلى واحدة) دەگێڕدرایەوە بۆ یەك تەڵاق، لەگەڵ ئەو تەئویلەیدا کە باسمانکرد تێك ناکاتەوە و ناگونجێت.

٣. گریمان وادابنێین کە ئەو فەرموودەیە ئەو شرۆڤە و راڤە تەئویلکردنە هەڵدەگرێت کە بۆی کرا، جا لە کاتی ئەم گریمانەیەشدا دەبێت ملکەچی ئەو ڕاستییە بین، کە پێشەوا عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت)، مافی دەسەڵاتی یاسادانانی لە دەرکردنی بڕیارەکاندا دراوەتە دەست و ئەویش چووە بڕیارێکی دەرکردووە، کە پێچەوانەی فەرمانی خودا و پێغەمبەری خودایە (صلی الله علیه وسلم)، لەو ڕوانگەیەوە کە پێشەوا عومەر، داهێنەری بێژەی (الثلاث)ە، لە دەستەواژەکەدا، لەکاتێکدا کە ئەمە بە ئەفراندن (بیدعە)یەکی خراپ و دژ و پێچەوانە دادەنرێت، کە تێکگیرانی هەیە لەگەڵ ئەو میتۆدەیدا کە لە قورئان و سوننەتدا چەسپاوە، کە بەپێی ئەو میتۆد و پەیڕەوە دەبێت، تەڵاق دابەش بکرێت بەسەر جار (مرَّة) و قۆناغەکاندا نەوەك بەسەر ژمارەدا.

جا چۆن شەرعدانانی لەم جۆرە دەدرێتە پاڵ پێشەوا عومەر؟ بەڵێ، پێشەوا عومەر هەڵسا، بەتایبەت (تخصیص) کردنی، دەقەکان و بەستنەوەی مەرج پێیانەوە، لەبەر ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی گشتی و بنیاتنانی دامەزراوە کارگێڕییەکان و دەامودەزگاکانی دادوەری و سەربازی، وەك دیوانەکان، ئەمەیش لەبەر بەرژەوەندی گشتی.... بەڵام ئایا چ بەرژەوەندییەك هەیە، لە ڕووخاندنی کۆشك و پرۆسەی هاوسەرایەتیدا، بە چاو ترووسکانێك لەکاتێکدا

[1] زاد المعاد، ب٤، ل٥٤.

بە چەندەها سالّی تەمەن بنیاتنراوە و بەرخودانی لەپێناودا کراوە؟! هەروەها چ بەرژەوەندییەك هەیە، لەو وێرانکردن و کارەساتبارکردنەدا کە هۆکارە بۆ هەلّوەشانی خێزان و پەرتەوازەبوونی منداڵەکانیان؟!

٤. ئەو شەرعزانانەی کە دەلّێن: سێ تەلاّقە بە یەکجار و پێکەوە دەکەون، فەرموودەگەلێکیان کردووەتە بەلّگە و پشتیان پێبەستووە، کە لە خودی خۆیاندا بەلّگەن لەسەر بەکارهێنانی دەستەواژەی سێ تەلاّقە لەسەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم).

٥. شرۆڤە (تەئویلکردن)ـی، ئەو پرسە بەو جۆرەی کە خەلّکی لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) تەنها یەك تەلاّقیان دەخست، لە سەردەمی جێنشینایەتی پێشەوا عومەردا دەسیان کرد بە دەربڕینی تەلاّقی سێ بە سێ، لە ڕاستییدا ئەم شرۆڤەیە هەروەك پێشەوا ئیبن قەییمی جەوزی دەفەرموێت: سەر بە باسی مەتەلّ و لادانە لە مانا، نەوەك پرسی ڕوونکردنەوەی مەبەست و ئامانجەکانی بێت.

**چوارەم: توێژینەوەی ئەو بانگەشەیەی کە پێی وایە فەرموودەکە تایبەتە بە حالّەتی دووبارەکردنەوەی لەفزەکەوە:** پێشتر باسمان کرد کە هەندێك لەوانەی کە فەتوایان بەوە داوە کە تەلاّقی سێ بە سێ بەیەکجار و پێکەوە دەکەون، بەلای ئەوەدا چوون کە فەرموودەکەی عەبدوللاّی کوڕی عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێت) بەتایبەتی بۆ بڕیاری حالّەتی دووبارەبوونەوەی دەستەواژەی تەلاّقەکە هاتووە، لەلایەن مێردەکەوە بەوەی کە گوتوویەتی: (أنتِ طالقٌ) تەلاّقت کەوتبێت. (أنتِ طالقٌ) تەلاّقت کەوتبێت. (أنتِ طالقٌ) تەلاّقت کەوتبێت. جا پیاوەکە ئەم بانگەشەیەی لێ وەردەگیرێت کە مەبەستی جەختکردنەوە بووە، لەبەر ساغی دەروونەکان و پاکژی دلّەکان و لەسەردەمی یەکەمدا، بەلاّم دواترو لە سەردەمی پێشەوا عومەردا (ڕەزای خوای لێ بێت) کە دەروونەکان گۆڕان و متمانە نەما، ئیتر ئەو پیشەوایەش بڕیاریدا بە

وەرنەگرتنی ئەو بانگەشەیە لێیان.

لەڕاستییدا ئەم شرۆڤەیە (تەئویلکردنە) زۆر لاوازترە لە شرۆڤەکانی تر، کە باسمانکردن، لەبەر چەند فاکتەرێك، لەوانە:

١. دەستەواژەی و دەربڕینی فەرموودەکە هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی بەرپەرچی ئەم جۆرە شرۆڤەیە دەداتەوە.

٢. وەرگرتنی مەبەستی تەڵاقخەرە کە لەوەی کـە مەبەسـتی جەختکردنـەوە (تأكيد) بووە یان نا... ئەمە بڕیارێکە هەر لە سەرەتای هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە تا ئەمڕۆ کاری پێکراوە، بەبێ جیـاوازی کـردن لـە نێـوان هـیچ مێردێکدا، هەروەها بەبێ جیاوازی کردن لە نێـوانِ پیـاوی خـراپ و پیـاوی ڕاستاڵ و پیاوی ڕاستگۆ و پیاوی درۆزندا، بەبێ تایبەتکردن بـە کـات یـان شوێنێکی دیاریکراوەوە، لەو ڕوانگەیەوە کە دواجار ڕاهاتووەتە سەر ئەوەی کە بەلایەنی کەمەوە لە ڕووی ئاینەوە و بۆ قیامەت ئەم بانگەشەیە وەردەگیرێت کە کابرا دەڵێت مەبەستم لەم دووبارەکردنەوانە، جەختکردنەوە بووە، ئەگـەر دیسان لە ڕووی دادگا و دادوەریشەوە لێی وەرنەگیرێت، بەڵام بە مەرجی ئەوەی کە نیشانەیەك لە ئارادا نەبێت دژی بانگەشەی مێردەکە، ئەوا لە دادگا و لە ڕووی دنیاییەکەشەوە لێی وەردەگیرێت.

٣. هـەر پیاوێـك دەسـتەواژەیەکی وای هاتبێـت بـە دەمـدا کـە مانـای جەختکردنەوە هەڵبگرێت وەك دەستەواژەی: (أنتِ طالقٌ) تەڵاقت کـەوتبێت، (أنتِ طالقٌ) تەڵاقت کەوتبێت. (أنتِ طالقٌ) تەڵاقت کەوتبێت. و بانگەشەی ئەوە بکات کە مەبەستی جەختکردنەوە بـووە، ئـەوا ئـەم بانگەشـەیەی لـێ وەردەگیرێت، لەهەر سـەردەمێکدا بێـت، جـا چـۆن لـە سـەردەمی خەلیفـە ڕاشیدینەکاندا لێی وەرناگیرێت کە باشترینی سەدە و سەردەمەکان بووە؟!

ئەگەر مێردەکە دەستەواژەیەکی وای دەربڕیبێـت کـە مانـای جەختکردنـەوە نەدات بەدەسـتەوە وەك ڕسـتەی (أنـتِ طـالقٌ ثلاثـاً) سـێ بەسـێ تـەڵاقت

کەوتبێت. ئیتر کابرا ئاستی متمانە و سپاردەپارێزی و ڕاستی بانگەشەکەی لە هەر پلەیەکدا بێت، لێی وەرناگیرێت و بڕوای پێ ناکرێت.[1]

**پێنجەم: بەرپەرچدانەوەی ئەو تانانەی کە دراون، لە گێڕانەوەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس** (ڕەزای خوای لێ بێت): پێشەوا بەیهەقی ژمارەیەك گێڕانەوەی لە ئیبن عەباسەوە هێناوە کە مانای ئەوە دەدەن بەدەستەوە کە سێ تەڵاقە بە جارێك و پێکەوە دەکەون، دواتر لە ئیبن مونزیرەوە ئەوە دەگێڕێتەوە کە وا گومان نابات بە ئیبن عەبباس کە زانیارییەکی لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) بیستبێت و کەچی بەپێچەوانەی ئەو زانیارییەوە فەتوا بدات، دواجار چارەنووسی ڕای ئەم زانایە لەم پرسەدا دێتە سەر دیاریکردنی ڕای پەسەند لە نێوان پابەندبوون بەڕای زۆرینە و یان ڕای تاکەکەس و بێگومان وابەستە بوون بە ڕای زۆرینەوە لەپێشترە، لەوەرگرتنی ڕای تاکەکەس، لەکاتێکدا ئەو کەسە قسەکەی پێچەوانەی ڕای زۆرینە بێت.

پێشەوا ئیبن عەرەبی دەفەرموێت: ڕاجیایی لەسەر ئاستی صەحیحێتی ئەم فەرموودەیە هەیە جا ئیتر چۆن دەگونجێت کە پێش بخرێت بەسەر کۆڕای زانایان (اجماع)دا؟ هەروەها دەفەرموێت: فەرموودەکەی مەحموودی کوڕی لەبیدیش پێچەوانەیە لەگەڵیدا، چونکە ئەم فەرموودەیە بەڕاشکاوی ئەوەی تێدایە کە ئەگەر پیاوێك هەر سێ تەڵاقی پێکەوە بخستایە ئەوا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕێڵی نەدەکرد و جێبەجێی دەکرد بەسەریدا.

- هەروەها زانایان و فەرموودەناسان فەرموویانە کە پێشەوا موسلیم هەر خۆی (بەتاکی) ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، چەندەها تانەی تر هەن، کە ئاراستەی ئەم گێڕانەوەیەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس کراون، کە ئەم تانە زۆرانە دەبنە پاساو بۆ کارکردن بە فەتواکەی، لەڕاستییدا گێڕانەوەکەی ئیبن

---

[1] بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە: نیل الأوطار، ب٦، ل٢٦٢. زاد المعاد، ب٤، ل١٦.

عەبباس بووەتە گێڕانەوەیەکی باوڕ ناسراو، بۆیە لەلای گەورە زانایانی فەرموودەی وەك پێشەوا موسلیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) چەسپاوە و بە صەحیح هەژمار کراوە و دانراوە و هەریەکە لە شیخ الاسلام ئیبن تەیمیە و پێشەوا ئیبن قەیمی جەوزی تاوتوێ و شرۆڤەی ئەو ئاراستەیەیان کردووە، کە شەرعزانەکان وابەستەن پێیەوە، کە ئەو ئاراستەیەش لە بایەخ و گرنگیی گێڕانەوەکەی ئیبن عەبباس کەم دەکەنەوە و بوار دەڕەخسێنن بۆ کارکردن بە فەتواکەی.

- شیخ الاسلام ئیبن تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: نەمانبیستووە و نەمانزانیوە کە کەسێك سێ تەڵاقەی ژنەکەی دابێت لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بەیەك وشە و دەربڕین، جا پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) پابەندی کردبێت بەهەر سێکیانەوە، لەم بارەیشەوە هیچ گێڕانەوەیەکی دروست یان جوان (حَسَنْ) نەگێڕدراوەتەوە و خاوەنی پەرتووکە بڕواپێکراوەکانیش هیچ زانیارییەکی لەم جۆرەیان نەگواستووەتەوە بۆمان، بەڵکو لەم بارەیەوە فەرموودە گەلێکیان گێڕاوەتەوە کە سەرجەمیان لاوازن، بەپێی فەرمایشی تێکڕای زانایانی فەرموودە، تەنانەت هەڵبەستراویشن، تەنانەت ئەو فەرموودەیەی کە لە پەرتووکی صەحیحی موسلیم و سونەن و موسندەکانی تری فەرموودەشدا هاتووە کە لە طاوس ئەویش لە ئیبن عەبباسەوە گێڕاویەتییەوە هەر ئەوەیە کە دەڵێت: (تەڵاق لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) و پێشەوا ئەبوبەکر و دوو ساڵ لە جێنشینایەتی پێشەوای عومەردا سێ تەڵاقە یەکێك بوو)، پێشەوا عومەر فەرمووی: بێگومان خەڵکی لە کارێکدا پەلەیان کرد کە دەبوو تیایدا لەسەرخۆ و شێنەیی بن، نابێت بەریان بۆ شل بکەین، بۆیە هەرسێ تەڵاقەکەی بەسەردا چەسپاندن و هەژماری کردن لەسەریان. لە گێڕانەوەیەکی پێشەوا موسلیم و هی تریشدا هاتووە لە طاوسەوە کە کە ئەبو صەهباء بە ئیبن عەبباسی گوت: ئایا دەزانیت کە لە سەردەمی پێغەمبەر

(صلی الله علیه وسلم) و پێشەوا ئەبوبەکردا سێ تەلاق بە تەلاقێك هەژمار دەکرا و دواتر لە سەردەمی فەرمانڕەوایی پێشەوا عومەردا هەر سێ تەلاقەکە هەژمار کرا، ئیبن عەبباس لە وەلامدا فەرمووی: بەڵێ، لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە ئەبو صەهباء بە ئیبن عەبباسی گوت ئەوەی لەلاتە بیهێنە، ئایا تەلاقی سێ بە سێ لەسەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و پێشەوا ئەبوبەکر بەیەك دانە هەژمار نەدەکرا؟ ئەویش گوتی: بەڵێ وابوو، بەلام لە سەردەمی پێشەوا عومەردا خەڵکی سەریان تێکرد و تەلاقیان بەسەریەکەوە دەهات بەدەمدا، بۆیە سەپاندی بەسەریاندا و ئیدی لەسەریان هەژمار کردن.[1]

- پێشەوا ئیبن قەیمی جەوزی (رەحمەتی خوای لێ بێت) قسە ئاراستەی ئەوانە دەکات کە تانە لە گێڕانەوەکەی ئیبن عەبباس دەدەن و کار بە فەتواکەی دەکەن و دەفەرموێت: ئایا سەرجەمی ئێوە یاخود هەرکەس کە ڕای وەك ئێوە وایە، لە هەموو پرسێکی لەم جۆرەدا کە پێشەوا موسلیم تەنها خۆی بێت و پێشەوا بوخاری لەگەڵدا نەبێت، هەر بەم جۆرە مامەڵە دەکەن؟! یان تەنها لەم پرسەدا بەم حاڵەتە ڕەفتار دەکەن و بەس؟! ئایا پێشەوا بوخاری هەرگیز شتی وای فەرمووە کە بڵێت: هەر فەرموودەیەك کە لەم پەڕتووکەمدا نەمهێنابێت ئیتر ئەوە فەرموودەیەکی بەتاڵە و کارپێنەکراوە؟! یاخود نابێتە بەڵگە و لاوازە؟! ئایا پێشەوا بوخاری چەندەها فەرموودەی نەکردووەتە بەڵگە کە لە دەرەوەی پەرتووکە صەحیحەکەیدان و هەر باسیشی نەکردوون؟! ئایا چەندەها فەرموودەی لە دەرەوەی پەرتووکەکەی خۆی بە صەحیح دانەناون؟! ئاشان دەڵێت: جا پرسیارتان لێ دەکەم، ئایا وەرگرتنی گێڕانەوەی هاوەڵان لای ئێوە کارپێکراوە، یان فەتواکەی؟! ئەگەر لە وەلامدا بڵێن کارپێکردن و وەرگرتنی گێڕانەوەکەی لامان مەبەستە، ئەمە ڕای جەماوەرەکەتانە و

---

[1] مجموع الفتاوی، لشیخ الاسلام ابن تیمیة، ب٣٣، ل١٢- ١٣.

تەنانەت ڕای سەراپای جەماوەری زانایانی گەلی ئیسلامە، جا سەبارەت بەمەیان ئەم وەلاّمەی ئێمەتان بەسە و دواتر ئەگەر بلێین کار بە فەتواکەی دەکەین، خۆ ئەوەتا بیروڕا و قسە دژ و پێچەوانەکانی خۆتانمان هەموو باسکرد و پیشانمان دان، کە هیچ تەکتیکێکتان بەدەستەوە نەماوە بۆ بەرگری کردن و پینەوپەڕۆ کردنیان و بەتایبەتی لە خودی ئیبن عەبباس.... تا دێت.[1]

## تاووتوێکردن و توێژینەوەی بە بەڵگەکردنی کۆڕای زانایان (الإجماع):

بانگەشەکردن لەسەر بوونی ئیجماع لەسەر ئەم پرسە، بانگەشەیەکی نەچەسپاوە و پێچەوانەیە لەگەڵ ڕاستی و واقیعدا، چونکە لێرەدا بەڵگەی زۆر و گێڕانەوەی بەناوبانگ هەن سەلمێنەری ئەو ڕاستییەن کە هیچ جۆرە ئیجماعێك لە هیچ سەردەمێك لە سەردەمەکاندا بەرپا نەبووە، و نەچەسپاوە، هەر لە سەرەتای هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە، تا ئەمڕۆ کە گەێینەری ئەوە بێت کە دروستە سێ تەلاّقە بەیەکجار بخرێت.

- پێشەوا ئیبن حەجەری عەسقەلانی لە ڕاڤەی ئەو فەرمایشتەی پێشەوا بوخاریدا کە نووسیویەتی: (بـاب مَـنْ جَـوَّزَ الطـلاق الـثلاث) بەشەباسی ئەوانەی کە ڕێگایان بە خستنی تەلاّقی سێ بەسێ داوە، دەفەرموێت: لە ناونیشانی ئەم فەرمایشتەدا ئاماژەی ئەوە هەیە، کە لە چینی پێشیناندا زاناگەلێك هەبوون کە ڕێگەیان بە خستنی سێ تەلاّقە پێکەوە نەداوە و بە دروستیان نەزانیوە.[2]

- لە ڕاڤەی فەرموودەکەی (ڕوکانە)دا، هاتووە، کە دەڵێت:

---

[1] بۆ درێژە باسی ئەم پرسە، بڕوانە پەرتووکی (زاد المعاد في هدي خير العباد) نووسینی پێشەوا ئیبن قەیمی جەوزی، ب٤، ل٦٠ ـ ٦١.

[2] فتح الباري، شرح صحيح البخاري، ب٩، ل٢٦٢.

ڕووکانەی کوڕی عەبد یەزید، ژنەکەی سێ بەسێ تەڵاق دا لە یەك شوێنی کۆبوونەوە (مجلس)دا و جا دواتر دڵی داتەپی بۆ ژنەکەی و زۆر غەمگین بوو بۆی، جا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پرسیاری لێکرد کە چۆن تەڵاقت دا؟ ئەویش وتی: بە سێ تەڵاقە تەڵاقمدا و لەیەك کۆڕدا، جا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: دەی ئەوە بەیەك تەڵاق هەژمار دەکرێت، بیگێڕەوە لای خۆت، ئیتر ئەویش گێڕایەوە ژێر نیکاحی خۆی.

ـ حافظ ئیبن حەجەری عەسقەلانی دەفەرموێت: لە پێشەوا عەلی و ئیبن مەسعود و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و زوبێرەوە (ڕەزای خوا لە هەموویان بێت) زانیاری لەم جۆرە گوێزراوەتەوە ئەوەتا (ئیبن موغیث) لە پەرتووکی (کتاب الوثائق)دا شتی لەم بابەتی گواستووەتەوە و داویەتییە پاڵ موحەممەدی کوڕی وەضاح، هەروەها غەنەویش زانیاری لەم جۆرەی گواستووەتەوە لە کۆمەڵێك لە زانا مەزنەکانی قورتووبەوە، وەك موحەممەدی کوڕی تەقی کوڕی موخەللەد، موحەممەدی کوڕی عەبدولسەلامی خەشەنی و هی تریش. هەروەها ئیبن مونزیریش لە عەطا و طاووس و عەمری کوڕی دینارەوە کە لە هاوەڵانی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسن زانیاری لەم جۆرەی گواستووەتەوە، جێگای سەرسوڕمانە لە ئیبن تینەوە لەو ڕوانگەیەوە کە دەڵێت خستنی تەڵاقی سێ بە سێ لە ڕووی خستنیەوە و کەوتنی تەڵاقەکەوە هیچ ڕاجیاییەکی لەسەر نییە، بەڵکو ڕاجیایی لە حەرامێتی بەدەمەدا هاتنی تەڵاقی سێ بە سێ پێکەوەدایە، لەکاتێکدا کە هەروەك بینیمان ئەم ڕاجیاییە بوونی هەیە و چەسپاوە.[1]

ـ پێشەوا عەینی کە خاوەنی پەرتووکی (عمدة القاري)یە، و شرۆڤەی صەحیحی بوخارییە، لە ڕاڤەی (باب من اجاز الطلاق الثلاث) بەشە باسی ئەوانەی کە خستنی تەڵاقی سێ بە سێ پێکەوە بەرێگەپێدراو دەزانن،

---

[1] فتح الباري، شرح صحيح البخاري، ب٩، ل٣٦٢.

فەرموویەتی: ئەم ناونیشانە ئەوە دەدات بەدەستەوە کە ئەمە بەشە باسی روونکردنەوەی قسەی ئەوانەیە کە بە دروست و ڕێگەپێدراوی دەزانن کە ژن تەڵاق بدرێت، بە سێ تەڵاقە و بەیەکجاری، پێشەوا بوخاری ئەم ناونیشانەی داناوە وەك ئاماژەیەك بۆ ئەوەی کە لە زانایانی چینی پێشینە (السَلَف) دا هەبوون، کە ڕایان وابووە کە خستنی سێ تەڵاقەیان پێکەوە بە دروست نەزانیوە، بەڵام ئەم پرسە ڕاجیایی تێدایە، جا طاووس و موحەممەدی کوڕی ئیسحاق و حەجاجی کوڕی أرطأة و نەخەعی و ئیبن موقاتیل و ظاهیرییەکان پێیان وایە کە پیاو ئەگەر ژنەکەی بە سێ تەڵاقە هەرسێك پێکەوە، تەڵاق دا ئەوا تەنها یەك تەڵاقیان دەکەوێت.

بەڵگەشیان بۆ ئەم ڕایە ئەو فەرموودەیەیە کە پێشەوا موسلیم دەیگێڕێتەوە لە فەرموودەکەی طاووسەوە کەوا ئەبو صەهباء بە ئیبن عەبباسی گوت ئایا دەزانیت سێ تەڵاقە بە یەك تەڵاق دادەنرا لەسەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و سەردەمی پێشەوا ئەبوبەکر و دوای بە سێ تەڵاق هەژمار کرا، لەسەردەمی جێنشینایەتی پێشەوا عومەردا، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس لە وەڵامدا فەرمووی بەڵێ.[1]

ـ شیخ الاسلام ئیبن تەیمیە دەفەرموێت: ئەم قسەیەی کە دەڵێت: "تەڵاقی سێ بە سێ بەیەك تەڵاق هەژمار دەکرێت". لە کۆمەڵێك لە زانایانی پێشین و پاشینەوە گوێزراوەتەوە بۆمان، ئەوانیش لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك زوبێری کوڕی عەوام و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفەوە گواستوویانەتەوە، هەروەها ئەم فەرمایشتە لە پێشەوا عەلی و ئیبن مەسعودەوە گێڕدراوەتەوە و ئیبن عەبباسیش دوو فەرمایشتی لەم پرسەدا هەیە[2].

---

[1] عمدة القاري شرح صحيح البخاري، للعيني، ب٢٠، ل٢٣٣.

[2] مجموع الفتاوى، لشيخ الاسلام ابن تيمية، ب٨، ل٣٣.

ـ پێشەوا ئیبن قەیمی جەوزی دەفەرموێت: سوپاس بۆ خوا، گەلی ئیسلام کۆنەبۆتەوە، لەسەر دژایەتی کردنی ئەم فەرمایشتە، واتە دژنەبۆتەوە لەگەڵ ئەو ڕایەدا کە مسوڵمانان لە سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و پێشەوا ئەبوبەکردا لەسەری بوون، کە سێ تەلاقەیان بەیەك تەلاق خستووە، بەڵکو بەردەوام لە ناویاندا زاناگەلێك هەبوون کە سەدە لە دوای سەدە و تا ئەمڕۆش هەر لەسەر ئەم شێوازە بڕیاریانداوە و فەرتوایان دەرکردووە. جا دەریای زانستی گەلی ئیسلام و وەرگێڕ و ڕاڤیاری قورئان (عەبدوڵڵای کوڕی عەباس) بەم شێوازە فەتوای داوە و هەروەها ئیبن وەضاح لە زوبێری کوڕی عەووام و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفەوە دەگێڕێتەوە کە سێ تەلاقەیان بە یەك تەلاق خستووە و هەروەها دوو گێڕانەوە لە پێشەوا عەلی و ئیبن مەسعودەوە هاتوون، هەروەك دوانیش لە ئیبن عەبباسەوە گێڕدراوەتەوە.[1]

جا لە ڕوانگەی ئەم سەرچاوە بڕواپێکراوانە و هی تریشدا، ئەوە دەچەسپێت کە بانگەشەکردنی بوونی ئیجماع لەسەر دروستی کەوتنی سێ تەلاقە پێکەوە و بە یەکجار، بانگەشەیەکی بەتاڵە و هیچ بنەمایەکی نییە، ئەم بانگەشەیە سەر بەباسی تێکەڵ و پێکەڵکردنی پرسی ئیجماع و کۆکبوونی موجتەهیدەکانی ئوممەتی موحەممەدە (صلی الله علیه وسلم)، لەگەڵ ئەو ئیجماعەیدا کە شەرعزانانی تەنها مەزهەبێك لەسەری کۆبوونەتەوە و کۆڕایان کردووە، ئای ئەم دوو ئیجماعەیش چەندە لە یەکترییەوە دوورن!

## تاوتوێکردن و توێژینەوەی بە بەڵگەکردنی (قیاس : بەبەردا گرتن) لەم پرسەدا:

ئەو گرووپەی کە ڕایان وایە سێ تەلاقە بەیەکجار دەکەوێت، ئەمەیان کردووەتە بەڵگە کە گرێبەستی هاوسەرێتی (النکاح) مولکی پیاوەکەیە و

---

[1] اعلام الموقعین، ب٣، ل٤٨ و دواتریش.

دەتوانێت بەیەکجار وازی لێ بهێنێت و دەستبەرداری ببێت، ئەمەیش لەسەر قیاسی ئەوەی کە هەر ئەو کابرایە چۆن دەتوانێت دەستبەرداری مافەکانی تری خۆی ببێت لەم مافی خاوەنێتی هاوسەرایەتییەشدا هەروایە، هەروەها بە قیاسکردنی لەسەر پرسی (الاعتاق) ئازادکردنی بەندە و (النذر) پەیمان دان، هەروەك پێشتر باسمان کردن.

ئێمە وای دەبینین کە قیاسکردن لە سەرجەمی ئەم شێوازانەدا بەتاڵە، لەبەرئەم هۆکارانەی لای خوارەوە:

## یەکەم: قیاسکردنی ئەم پرسە لەسەر پرسی دەستبەردار بوون لەهەر مافێکی تر:

ئەمە قیاسکردنێکی قەڵبە، چونکە مرۆڤ ئازاد نییە لە دەستبەرداربوونی لەسەرجەم ئەو مافانەی کە هەیەتی، چونکە لە ناو ئەو مافانەیدا مافی وا هەیە کە پەیوەستە بە بەرژەوەندی خەڵکی ترەوە، کە دەستبەرداری ببێت، ئەوا زیانی لێ دەدات، وەك مافی دایەنی (الحضانة) کە دروست نییە دەست لەو مافە هەڵبگرێت و دەستبەرداری ببێت، ئەمەیش لەبەر هۆکاری پاراستنی بەرژەوەندی منداڵەکەیە، هەروەك مافی هەموو کەسێك لەو سنوورەدا کۆتایی دێت، کە سنووری مافی کەسێکی تر دەست پێدەکات، جا بۆیە بۆ پیاو دروست نییە، کەی و هەرچۆنێ ویستی دەست بکاتە تەلاَقدان، چونکە ئەم جۆرە تەلاَقدانە شوێنەواری خراپ لەسەر ژنەکە و منداڵەکانی جێدەهێڵێت و جاری وا هەیە کە دەرەنجامە خراپەکانی کاری لەم جۆرە تەنها بە کاریگەری خراپ لەسەر خێزان ناوەستێت، بەڵکو تێی دەپەڕێنێت، بۆ سەر کۆمەڵگەش و ئیسلامیش هەر لە سەرەتای هاتنیەوە ئەم راستییەی چەسپاندووە کە مافەکان ئەرك و بەرپرسیارێتیی کۆمەڵایەتین، بۆیە ئەو خاوەن مافانە بۆیان نییە کە چۆن دەیانەوێت و حەز دەکەن، مامەڵە لەگەڵ ئەو مافانەدا بکەن، لە دوای هاتنی ئیسلام بە دەیان سەدە یاساناسان گرنگی و بایەخی ئەم

بیردۆزەیان بۆ دەرکەوت، بـۆ یەکـەجار زانـای فەرەنسـی (duquit) ئـەم ڕاستییەی لە وانەیەکدا قاو دا، ئەوەی ڕاگەیاند کە بوونی موڵکیـەت مـاف نییە، بەڵکو موڵکیەت ئەرکێکی کۆمەڵایەتییە.

دووەم: قیاسکردنی ئەم پرسە لەسـەر پرسـی بەنـدە ئـازادکردن (الاعتاق):

ئەمەیشیان قیاسکردنێکی ناقلۆکارە و نەگونجاوە، چونکە لە پرۆسەی بەنـدە ئازادکردندا سودی تاك و کۆمەڵگە و ئوممەتیش هەیە، بۆیە ئیسلام لەسـەر ئەم پرسە هانی داوین و چەندەها ڕێگای داناوە بۆ کۆتایی هێنان بەم دیاردەی بە بەندەکردنی مرۆڤە لەلایەن برا مرۆڤەکەی تریەوە، کە ئەم پرسە دژایەتی و پێچەوانەگەری هەیە لەگەڵ ئەو میتۆدە یەکسانییەی کـە قورئـانی پـیرۆز بانگەشـەی بـۆ کـردووە لـە ئایـەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾﴾،[1] واتە: ئەی خەڵکینە ئێمە دروستمان کردوون لە ڕەگەزی نێر و مێ و کردوومانن‌ەتە گەل و تیرەی جیاجیا تا یـەکتری بناسـن و بەڕاسـتی بەڕێزترینتان لای خودا ئەوەتانە کە زیاتر لەخواترس بێت.

لەکاتێکدا کە تەڵاق زۆر بەکـەمی خراپـە و زیانگەیانـدنی تێـدا نییـە بـۆ هاوسەرەکان، یان یەکێکیان و یان بۆ منداڵەکانیان!

---

[1] (الحجرات: ١٣)، واتـە: ئـەی خەڵکینـە ئێمـە هـەمووتانمان لـە نێـر و مـێ یـەك دروست کردووە، کە باوکە ئادەم و دایکە حەوایە، و کردوومانن بـە گـەلان و تـیرە و هـۆزانی جـۆر بـەجۆر، تـا یـەکتر بناسـن و پەیوەنـدیتان خـۆش بـێ بەیەکەوە، بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوداوەند ئەوەتانە کە زۆرتر لـە خـوا ترسە و فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوداوەند زاناو ئاگایە بە هەمووان.

## سێیەم: قیاسکردنی ئەم پرسە لەسەر پرسی پەیمانەکان (النذور):

ئەم قیاسکردنەشیان لە دوورمەودایی و خراپیدا کەمتر نییە لەو دوو قیاسە پێشووەکەی تر، چونکە لە پەیمان (النذر)دا خواپەرستی (العبادة) هەیە و دروستە کە مرۆڤ دەروونی خۆی پابەند بکات پێیەوە، بەمەبەستی خۆنزیک کردنەوە لە خودای مەزن وەك ئەوەی کە بڵێت لەسەرم پەیمان بێت کە ئەوەندە خێر بکەم، یان ئەوەندە ڕۆژوو بگرم، ئەمە بەپێچەوانەی پرسی تەڵاقەوە کە پرسێکە سەرپێچی خوای پەروەردگاری تێدایە و بوغزێنراوترین جۆری حەڵاڵەکانە لەلای خوای گەورە، ئەگەر لەبەر پێویستییەکی زۆر و ناچارییەکی نالەبار نەبێت نابێت بەکاربێت، هەرکاتیش پێویست بوو ئەوا تەنها یەك تەڵاق بەسە، چونکە هەموو پێویستییەك بە ئەندازەی قەبارەی ئەو پێویستییە ئەندازەگیری دەکرێت.

# بەشە باسی چوارەم
# ئەو دەستەواژەیەی کە بۆ تەڵاق بەکارهاتووە، و ژمارەی تێدا دیاری کراوە، تەنها یەك تەڵاقی پێ دەکەوێت!

هەروەك پێشتریش ڕوونکرایەوە[1]، کە هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیـه وسـلم) و شـوێنکەوتووان و شـوێنکەوتەی شـوێنکەوتووانیش ئـەم ئاراستەیەیان گرتووە، هەروەها هەندێ شەرعزانی ناو مەزهەبە ئیسـلامییە جۆراوجۆرەکانیش هەر ئەم رایەیان دەربڕیوە وەك موحەممەدی کوڕی موقاتیـل لە مەزهەبی حەنەفی و هەندێ لە مالیکییـەکان و جـەماوەری جەعفـەری و زەیدی و ظاهیرییەکان و ژمارەیەکی زۆر لـە زانایـانی ئـەم دواییـەش هـەر دەستیان بەم رایەوە گرتووە و یاسـاکانی بـاری کەسـێتی سـەرجەمی وڵاتـە ئیسلامییەکان لەسەر ئەم ڕایە جـێگیر بـوون و کـار بـەم ڕایـە دەکـەن لـە بڕیارەکانیاندا.

## ڕاڕەوی حەنەفییەکان:

لە پەرتووکی (إغاثة اللهفان) دا هاتووە کە دەڵێت: (المازري) لە پـەڕتووکی (المُعْلَمْ)دا گێڕاویەتییەوە لە موحەممەدی کوڕی موقاتیلەوە کە لـە هـاوەڵانی پێشـەوا ئەبوحەنیفەیـە، کـە فەرموویـەتی: ئـەم ڕایـە یەکێکـە لـە دوو فەرمایشتەکەی مـەزهەبی حەنەفی، شایەنی باسە موحەممەدی کوڕی موقاتیل لە هاوەڵانی پێشەوا ئەبوحەنیفەیـە و لـە شـکۆمەندترین چـینی سـێیەمی

[1] واتە لە پەڕتووکی: (مدى سلطان الارادة في الطلاق في الشرائع والقوانين والأعراف خلال أربعة آلاف سنة)دا، ل٢٦٥.

هاوەڵاتی ئەم ڕاڕەوەیە لەناو هاوەڵاتی پێشەوا ئەبو حەنیفەدا.[1]
هەروەها لە پەرتووکی (اعلام الموقعین)دا هاتووە کە نووسیوویەتی: لە ئەبوبەکری رازی و ئەویش لە موحەممەدی کوڕی موقاتیل گێڕاویەتییەوە کە هەندێ لە حەنەفییەکان فەتوایان بە پێی ئەم ئاڕاستەیەدا داوە.[2]
- لە (أحكام القرآن)ـی، پێشەوا (جەصاص)دا، هاتووە لە تەفسیری (ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ)دا، کە نووسیویەتی: بەڵگە لەسەر ئەوەی کە مەبەست لەم دەقە فەرمانکردنە بە دابەشکردن و جیاکردنەوەی تەڵاق، ئەوەیە کە ئەگەر کەسێك دوو تەڵاقی پێکەوە بدایە، ئەوا دروست نەدەبوو کە بگوترێت دوو جار تەڵاقی دا.[3]

## ڕاڕەوی مالیکییەکان:

لە پەرتووکی (إغاثة اللهفان)دا، هاتووە کە نووسیویەتی: تەلمەسانی لە شەرحی (التفريع في مذهب الإمام مالك)دا، قسەیەکی لەم جۆرەی لە مەزهەبەکەیدا هێناوە، تەنانەت گێڕانەوەیەکی هەر لە خودی پێشەوا مالیکەوە هێناوە و زانایانی غەیری ئەمیش قسەی لەم جۆرەیان لە مەزهەبی ئیمام مالیکەوە گێڕاوەتەوە و ئەم قسەیە واتە خستنی سێ تەڵاقە بەیەك تەڵاق، یەکێکە لە دوو ڕاکانی ڕاڕەوی پێشەوا مالیك و ڕاڕەوی پێشەوا ئەبو حەنیفە و (شيخ الاسلام)یش لە هەندێ لە هاوەڵاتی پێشەوا ئەحمەدەوە ئەم ڕایەی گێڕاوەتەوە و خۆیشی هەر ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە.[4]
- لە فەرمایشتی (ئیبن ڕوشدی مالیکیەوە) پێشخستنی ئەم ڕایە بەچار

---

[1] إغاثة اللهفان من مصايد الشيطان، ب١، ل٣٠٨.

[2] اعلام الموقعين، ب٣، ل٣٥.

[3] أحكام القرآن، للإمام أبي بكر محمد بن علي الرازي الجصاص الحنفي، ب٢، ل٧٣.

[4] (إغاثة اللهفان) ب١، ل٣٠٨.

دەكەوێت و ئەم ڕایەی تەرجیح داوە، لەو ڕوانگەیەوە كە دەڵێت:[1] لەوە دەچێت جەماوەری زانایان لایەنی قورسكردنیان لە تەڵاقدا پێشخستووە بەسەر لایەنی دەرفەتداندا، ئەمەیش لەبەر هۆكاری (سدّ الذريعة) بڕینی بیانوو و پاساو، بەڵام بەم كارەیان دەرفەتی شەرع (الرخصة الشرعية)یان هەڵوەشاندووەتەوە و مەبەستم لەو دەرفەت و نەرمی و ئاسانكارییە شەرعییە بریتییە لەم فەرمایشتەی پەروەردگار كە دەفەرموێت: (لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا)،[2] واتە: لەوانەیە خوای كارزان كارێكی تازە پێش بێنێت، ژن و پیاوەكە پەشیمان ببنەوە بۆ یەكتر، ئەو كاتە دەست بكەنەوە بە ژن و مێردایەتی خۆیان و ژیانێكی نوێ.

## ڕاڕەوی حەنبەلییەكان:

شیخ الاسلام ئیبنو تەیمیە دەفەرموێت: تەڵاقێك كە ژمارەی پێوە بەسترا بێت حەرامە و تەنها یەك تەڵاقی لەسەر هەژمار دەكرێت و بخۆرەكەی پێ پابەند دەكرێت و ئەم ڕایەش لە پێشینان و پاشینانی هاوەڵانی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) بۆمان گواستراوەتەوە، وەك: زوبێری كوڕی عەووام و عەبدوڕەحمانی كوڕی عەوف و هەروەها دوو جۆر قسە لەم بارەیەوە لە پێشەوا عەلی و عەبدوڵڵای كوڕی عەبباسەوە گێڕدراونەتەوە، هەروەها لە موحەممەدی كوڕی ئیسحاقەوە و هەر ئەم فەرمایشتەش لای زۆری تابعینەكان و ئەوانەی دوای ئەوان وەك طاووس و خەلاسی كوڕی عەمر كاری پێكراوە. هەروەها داود و

---

[1] بداية المجتهد ونهاية المقتصد، ب٢، ل٥١.

[2] ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُواْ ٱلْعِدَّةَ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ لَا تَدْرِى لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ۝١﴾ (الطلاق: ١)

زۆرینەی هاوەڵانی، کاریان بەم ئاراستەیە کردووە و هەر ئەم ڕایەش لە ئەبو جەعفەر، موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حسەین و جەعفەری کوڕی موحەممەدی کوڕییەوە گێڕدراوەتەوە. هەر لەبەر ئەم هۆکارەیشە کە شیعەکان ئەم ڕایەیان پەسەند کردووە، هەروەها هەندێ لە هاوەڵانی ئەبو حەنیفە و پێشەوا مالیك و پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کار بە فەرمایشتی ئەم ئاراستەیە دەکەن.[1]

## ڕاڕەوی جەعفەرییەکان:

لە پەرتووکی (الخلاف)[2]دا، هاتووە کە دەڵێت: ئەگەر پیاوێك ژنەکەی بە سێ بەسێ تەڵاق دا، بەڵام بە یەك دەربڕین، ئەوە دایهێناوە و یەك تەڵاقی پێ دەکەوێت، ئەمەش لە دوای کامڵبوون و بەدیهێنانی سەرجەمی مەرجەکان، کە ئەمە ڕای زۆرینەی هاوڕێیانمانە، هەمانە کە دەڵێت: هەر بە هیچ جۆرێك هیچ تەڵاقێکی پێ ناکەوێت، جا (علی) و ظاهیرییەکان بەوە فەتوایان داوە کە یەك تەڵاقی پێ دەکەوێت، هەروەها (طحاوي) لە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقەوە گێڕاویەتییەوە کە گوتوویەتی: هەریەك تەڵاقی پێ دەکەوێت، بەڵگەیشمان ئەوەیە کە کۆڕا هەیە لەسەر جیاکردنەوەی تەڵاقەکان و نەخستنیان پێکەوە و ڕێسای بنەڕەتیش وایە کە دەبێت گرێبەستەکە بەردەوام بێت.

ـ لە پەرتووکی (الروضة البهية)دا، هاتووە،[3] ئەگەر تەڵاق بە زیاتر لە دانەیەك مانا بکرێت وەك ئەوەی کابرا بڵێت سێ تەڵاقەت کەوتبێت، ئەوا ئەم مانا و شرۆڤەکردنەی بە زیاتر لە دانەیەك ماناکردنێکی پوچەڵە و پشتگوێخراوە و تەنها یەك دانەی پێ دەکەوێت.

---

[1] مجموع الفتاوى لشيخ الإسلام ابن تيمية، ب٨، ل٣٣.

[2] الخلاف في الفقه، للطوسي، ب٢، ل٢٢٦ ـ ٢٢٧.

[3] شرح اللمعة الدمشقية، ب٢، ل١٤٨.

- لە پەرتووکی (شرائع الاسلام)دا هاتووە:

ئەگەر تەڵاق بە دوو دانە یان سیّ دانە لێکدرایەوە گوتراوە کـە ئـەو تەڵاقـە بەتاڵە، هەروەها گوتراویشە کە تەنها یەك تەڵاقی پیّ دەکەویت.[1]

## رارەوی زەیدییەکان:

لە پەرتووکی (التاج المذهب) دا هاتووە کە نووسیویەتی: بڕیاری دووەم، لـە یاسا و ڕێساکانی تەڵاق ئەوەیە کە چەند تەڵاقێك بە دوای یەکدا نەهێنرێت، جا ئەگەر وا نەکرا و بە زیاتر لە تەڵاقێك تەڵاقی دا، ئەوا تەڵاقی دووەمیـان نابێتە شوێنکەوتەی تەڵاقی یەکەم و ناکەوێت، مەگەر لە کاتێکدا کـە لـە دوای تەڵاقی یەکەم گێڕابێتەوە ژێر نیکـاحی خـۆی، یـان گرێبەسـتی تـازە کردبێتەوە، دوای ئەوە تەڵاقی دووەمی دابێت، کەواتە هەردوو تەڵاقەکە یـەك تەڵاقی پیّ دەکەوێت، نەوەك دوو تەڵاق، ئیتر چونیەکە ئەو زیادەیە، دوو تەڵاقە بێت یان سیّ تەڵاقە، بەیەك دەربڕین بووبێت وەك سـیّ تەڵاقـەت کـەوتبێت، یاخود بە چەند دەربڕینێك بووبێت، وەك دەربڕینەکانی (أنتِ طالقٌ) تـەڵاقت کەوتبێت. (أنتِ طالقٌ) تەڵاقت کەوتبێت. (أنتِ طـالقٌ) تـەڵاقت کـەوتبێت. ئەمە تەنها یەك تەڵاقی پیّ دەکەوێت، چونکە تەڵاق لەلای ئێمـە لەهـەردوو شێوازەکەی سەرەوەدا - چ تەڵاقەکان پێکەوە بن بە دەربڕینێك یان جیاجیا بن - تەڵاق شوێنکەوتەی یەکتری نابن.[2]

- هاوێنەی ئەم ڕاستیەش لـە پـەرتووکی (الـدرّاري المضـية)[3] و (البحـر

---

[1] شرائع الاسلام، ب٢، ل٥٦.

[2] التـاج المـذهب لأحكـام المـذهب، شـرح مـتن الأزهـار في فقـه الأئمـة الأطهـار، للصنعاني، ب٢، ل١٩٩.

[3] الدرّاري المضية، شرح الدررّ البهية، للإمام الشوكاني، ب٢، ل٧١.

الزخّار)[1] و (المنتزع المختار)[2] دا هاتووە.

## ـ ڕاڕەوی ظاهیرییەکان:

ـ لە پەرتووکی (إغاثة اللّهفان) دا هاتووە کە نووسیویەتی:

لەو زانایانەی کە باسی ڕاجیاییەکان لەم پرسەدا کردووە : (داود) و هاوڕێکانین و ئەمانیش ئەم ڕایەیان هەڵبژاردووە کە سێ تەڵاقە بەیەك تەڵاق دادەنرێت.[3]

ـ لە پەرتووکی (مجموعه الفتاوی)ی شێخ الاسلام ئیبن تەیمیە دا هاتووە کە دەڵێت: ئەمە ڕای "داود" و هاوەڵانێتی و ظاهیرییەکانیش، جگە لە ئیبن حەزم کۆکن لەگەڵ ئەو ڕایەدا کە دەڵێت ئەو تەڵاقەی ژمارەی پێوە گرێدراوە تەنیا یەك تەڵاقی دەکەوێت.[4]

## بەڵگە و دۆکیۆمێنتەکانی ئەوانەی پشتیوانی لەم ڕایە دەکەن:

ئەو زاناگەلەی کە پشتیوانی لەم ڕایەدا دەکەن، کە دەڵێت: تەڵاقی ژمارەدار، تەنها یەك تەڵاقی پێ دەکەوێت، بەڵگە و دۆکیۆمێنتی زۆریان هەن، بۆ سەلماندنی ڕاکەیان، لە گرنگترین ئەو بەڵگانەش قورئانی پیرۆز و پاشان فەرموودەمانی پێغەمبەری دڵسۆز (صلی الله علیه وسلم) و پاشان قیاسکردنە.

---

[1] لە (البحر الزخّار)دا، (ب٣، ل١٧٤)، ئەوەی تێدایە، کە تەڵاق شوێنی تەڵاقی تر ناکەوێت، مەگەر لە دوای تەڵاقی یەکەم گێڕابێتییەوە ژێر نیکاحی خۆی، ئینجا تەڵاقی دووەمی دابێت، یاخود گرێبەستی نوێ کردبێتەوە.

[2] المنتزع المختار، ب٢، ل٤٥٢.

[3] إغاثة اللّهفان، ب١، ل٣٠٧.

[4] مجموعة الفتاوی، الشیخ الاسلام، ابن تیمیة، ب٨، ل٣٣.

## یەکەم: قورئانی پیرۆز:

یاساو ڕێسای گشتی لە شەریعەتی ئیسلامدا لەسەر ئەوەیە کە هەموو گرێبەستێك کە دەبوو هەردوولای گرێبەستەکە پێوەی پابەند بن ئەوا یەکێك لەو دوو لایەنە بەتاکڕەوانە و تەنها خۆی ناتوانێت کۆتایی پێ بهێنێت، تەنها لە حاڵەتی هەڵاوێرکراو (استثنائي) و بارودۆخە ناهەموار و کتوپڕەکاندا نەبێت و گرێبەستی هاوسەرێتیش یەکێکە لەو گرێبەستانەی کە هەردوو لای ژن و پیاو پابەند دەکات بە گرێبەستەکەوە و ئەم گرێبەستەیش چەندەها ماف و کاروباری پابەندکراوە لەسەر بنیاتنراوە، کە دابەشکراون بەسەر هەردوو لادا، دەبێت هەردوو لا پێوەیانەوە پابەند بن، جا بنەمای ئەم گرێبەستە ئەوەیە کە بەپێی ئەو یاسا گشتییەی باسکرا، پیاو دەسەڵاتی ئەوەی نییە کە تەنها و بە ویستی تاکڕەوانەی خۆی هەڵیبوەشێنێتەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە کە خوای پەروەردگار لەبەر هۆکاری چەند حیکمەت و بەرژەوەندییەك، لە حاڵەتی هەڵاواردن (إستثناء) و دەرفەتدان (رخصة)دا، ئەم دەسەڵاتەی بەخشیوەتە پیاو، بەڵام بە چەند مەرجێکی تایبەت، لە چوارچێوەیەکی سنووردار و دیاریکراودا، لەو مەجانەیش ئەوەیە کە دەبێت کۆتایی هێنان و پچڕاندنی پرۆسەی هاوسەرایەتی بە سێ قۆناغ ئەنجام بدرێت، لە نێوان هەر قۆناغێك بۆ قۆناغێکی تر ماوەیەك و کاتێك هەبێت، یاخود گێڕانەوە (رجعة) و یان گرێبەستێکی نوێ هەبێت، ئەمەیش رای هەندێ لە زانایانە بە پاڵپشتی بەڵگەیەك کە ئایەتی قورئانی پیرۆزە و دەفەرموێت: ﴿ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ﴾.[1]

---

[1] (البقرة : ٢٢٩ ).

## ڕوانگەی بە بەڵگەکردنی ئەم ئایەتە:

زانایان فەرموویانـە: (مَرَّتَـانِ) دووجـار، لـە زمـانی عـەرەبی و تەنانـەت زمانەکانی تری جیهانی مرۆڤایەتی، بۆ شتێك دەبێت کە جار لـە دوای جـار بێت، لە زاراوەی قورئانی پیرۆزدا (مرَّة) جار تەنها بۆ نوانـدنی ئـەم مانایـە هاتووە، وەك لەم ئایەتانەدا هاتووە: ﴿نَعْلَمُهُمْ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ﴾[1] و ﴿أَوَلَا يَرَوْنَ أَنَّهُمْ يُفْتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٍ مَّرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾﴾[2] و ﴿وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَىٰ ﴿٣٧﴾﴾،[3] جـا دەستەواژەی (ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ) لە دەربڕیندا هەواڵ و خەبەرە، بەڵام لـە مانـادا فەرمانپێکردنــە (أمــر)ە بــە جیاکردنــەوەی تەڵاقــەکان، هــەروەك لــە حوکمگەلێکی زۆردا و لـە هاوشـێوەی ئەمـەدا هـاتووە، وەك نموونـەی ئـەم ئایەتانە: ﴿وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ﴾،[4] واتە: (لیرضعن) با شیر بدەن، و هەروەها ئایـەتی: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴾[5] واتـە: (لیتربصن) با دان بە خۆیاندا بگرن، و چاوەڕوان بن.

دەربڕینی دەستەواژەکان بەشێوەی هەواڵـدان (خـبر) بـۆ ئەوەیـە کـە مانـای جەختکردنەوە (التأکید) و بـە تونـدوتۆڵی گـرتن (التشـدید)ی نـاوەڕۆکی فەرمانەکـە دەربخـات، فـەرمانکردنیش بـە کارێـك مانـای ڕێگـرتن لـە پێچەوانەکەی دەگرێتە خۆی و ڕێگرتن (نهي)یش، هیچ گومانێکی تێدا نییە

---

[1] (التوبة : ١٠١ )

[2] (النور : ٥٨ )

[3] (طه : ٣٧ )

[4] (البقرة : ٢٣٣ )

[5] (البقرة : ٢٢٨ )

کە ئامرازێکە تەنها بۆ رێگرتن لە شتی خراپ بەکاردەهێنرێت و دواجار کارکردن بە ئاراستە پێچەوانەکەی ئەو فەرمانەوە، دانپیانانە بەو خراپەیەدا. پێشەوا فەخرەدینی رازی (رەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت:[1] ئەم دەستەواژەیە هەرچەندە دەربڕین (لفظ)ەکەی بۆ خەبەردانە، بەڵام ماناکەی بۆ ئەمرکردنە، واتە (طلقوا مرّتين) تەڵاق بدەن بە دوو جار، کە (مرّتين) بە مانای (دفعَتَين) دوو جار هاتووە. بێگومان لێرەدا بۆیە لە دەستەواژەی ئەمر لایداوە بەرەو دەستەواژە و دەربڕینی (خبر) ئامێز، لەبەر ئەو هۆکارە بووە کە رابوردوو باسمان کرد بەوەی کە دەربڕینی ئەمر بەشێوەی (خبر) بۆ جەختکردنەوە (التأكيد) لەسەر مانای ئەمرەکە دێت، جا دواجار ئەوە چەسپا کە ئەم ئایەتە پیرۆزە مانای ئەوە دەدات بەدەستەوە کە فەرمانی تێدا کراوە بە دابەشکردنی تەڵاقەکان و لەم فەرمانکردنەیشدا بە توندوتۆڵی و زیاد لە پێویست پابەندبوونی تێدا بەرجەستەیە، جا ئەوانەی کە ئەمە رایانە جیاوازییان تێکەوتووە و ناکۆکن لەسەر دوو قسە:

یەکەمیان: ئەو قسەیەیە کە لەلایەن ژمارەیەکی زۆر لە زانایانی ئاینییەوە هەڵبژێردراوە، بەوەی کە ئەگەر پیاوێك ژنەکەی بە دوو تەڵاق یان سێ تەڵاقە تەڵاق دا تەنها تەڵاقێکیان دەکەوێت کە ئەم فەرمایشتە لە رووی قیاسەوە پەسەندترە، چونکە رێگرتن (نَهي) مانای ئەوە دەدات بەدەستەوە کە سەراپای شتە (نَهي) لێکراوەکە بەسەر خراپەیەکی لەپێشتردا دەگرێتە خۆ، جا لەم پرسەدا بڕیاردان بە کەوتنی تەڵاقەکان، هەوڵدانە بۆ هێنانەدی ئەو خراپەیە بۆ ناو ئەم پرۆسەیە، ئەمەیش کارێکی رێگەپێدراو نییە، بۆیە پێویستە بڕیار بدرێت بە نەکەوتنی تەڵاقەکان.

جا سەبارەت بە گرێبەستەکانیش چ ئەوانەیان کە بنیاتنەرن (الإنشاءات) یان ئەوانەی کە لە کۆڵخەرن (الإسقاطات) بوون و چییەتی (ماهیة)ی

---

[1] التفسير الكبير للإمام فخر الدين الرازي، ب٦، ل١٠٤.

مەعنەوییان نایەتە دی، هەروەها شوێنەوار و کاریگەرییان لە رووکەشدا دەرناکەوێت تا بە دەربڕینگەلێك دەرنەبڕدرێن، کە مانای ئەوانە هەڵبگرێت.[1]

جا لەم پرسەدا لەفزەکان سەر بە ئاراستە بنیاتنەرەکانن، بۆیە کە پیاو بە ژنەکەی گوت: (أنتِ طالقٌ) تەڵاقت کەوتبێت، لە کاتی بنیاتنانیدا ڕاستییەکی مەعنەوی و واقیعی بەدی دەهێنێت، بۆیە دواجار بەکارهێنان و سواغدانی ئەم ڕاستییە بە ژمارەگەلێکی وەك (دووجار) و (سێ جار) سواغدانی و وەصفکردنێکی بەتاڵ و بێ بنەمایە.

ـ عەللامە ئەبو حەییانی ئەندەلوسی[2] دەفەرموێت: ئەگەر پیاو گوتی بەژنەکەی دوو تەڵاقە یان سێ تەڵاقەت کەوتبێت ئەوە تەنها یەك تەڵاقیان دەکەوێت، چونکە ئەو سەرچاوەی تەڵاقەکەیە، ژمارەکەیش ئەوە دەخوازێت کە هەمان ئەو کردارەی کە ئەو کاریگەری تێدا دەکات دەبێت بە نیعلیی لە بووندا دووبارە ببێتەوە، وەك ئەوەی کە بڵێت: (ضربتُ ضربتَيْنِ) لێمدا بە دوو لێدان. یان (ثلاث ضربات) لێمدا بە سێ لێدان، چونکە لێرەدا چاوگ و سەرچاوەکەی روونکەرەوەی ژمارەی کردەوەکانە، جا هەرکات ژمارەکان لە بوون (وجود)دا دووبارە نەبوونەوە، ئەوا دووبارەبوونەوەی چاوگەکە و ئاستی روونکردنەوەی پلەبەندی ژمارەکانیشی تێدا مەحاڵە، جا هەرکات پیاوێك گوتی: (أنتِ طالقٌ ثلاثاً) سێ تەڵاقەت کەوتبێت، ئەمە یەك دەربڕینە، ئەوەیش کە ئەم مانای دەدات بەدەستەوە واتە (مەدلولەکەی) هەر یەکێکە و (یەك)یش مەحاڵە کە ببێتە (سێ) یان (دوو) و نموونەی ئەمەیش ئەوەیە کە مرۆڤێك بونیاتی مامەڵەیەك دابمەزرێنێت، لە نێوان خۆی و کەسێکی تردا لەسەر کاڵایەك، لەکاتی قسەوباسی مامەڵەکەدا بە کابرای بەرامبەر بڵێت:

---

[1] نظام الطلاق في الاسلام، أحمد شاكر، ل٤٦ و دواتریش.

[2] تفسير البحر المحيط، ب٢، ل١٩٢.

ئەوا سێ جار ئەم شتەم پێ فرۆشتی، کە لێرەدا دەستەواژەی (سێ جار) قسەیەکی پووچ و بێ بنەمایە و کۆك وتە با نییە، لەگەڵ قسەکانی پێش خۆیدا.

هەروەها شتە بونیاتنەرەکانیش (الإنشاءات) دووبارەکردنەوە تیایاندا مەحاڵە، تا بە گشتی دەستنەدەن بۆ ئەو پرۆسەی بنیاتنانە، ئەمەیش زانینی لەلایەن کەسێکەوە کەوا ڕاهاتووە، لە دەستەواژەی (طلقتك مرّتین) دووجار تەلآقمدایت، یان (ثلاثاً) یان سێ جار تەلآقمدایت، کە پێی وایە لەم حاڵەتەدا دوو جار یان سێ جار تەلآقی دەکەوێت تێگەیشتنی سەختە و بۆی هەرس ناکرێت.

جا لەم قسەیە و لەوانەی ڕابردوو لە هەنگاوەکانی تەلآق، ئەوە وەردەگیرێت کە تەلآق بە شوێن یەکتردا نایەن، ئەگەر بە دانەیەك زیاتر ژنەکەی تەلآق دا ئەوا دووەم و سێیەمیان ناکەون مەگەر گێڕاندنەوەی ژێر نیکاح (رجعة) لە نێوانیاندا روو بدات، یاخود گرێبەست نوێ بکەنەوە لە نێوان ئەو تەلآقانەدا، ئیتر چونیەکە بە دەربڕینی (أنتِ طالقٌ ثلاثاً) سێ تەلآقەت کەوتبێت، دەری ببڕێت یان بە دەستەواژەی (أنتِ طالقٌ) تەلآقت کەوتبێت، (أنتِ طالقٌ) تەلآقت کەوتبێت، (أنتِ طالقٌ) تەلآقت کەوتبێت، هەردوو شێوازی دەستەواژەکان هەر یەکێکن.

## دووەم: سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم):

گرنگترین فەرموودەیەك کە ئەم گرووپە پشتیان پێبەستووە، بریتییە لە فەرموودەکەی ئیبن عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێت) کە پێشتر باسکرا، ئەو توێژینەوە و گفتوگۆیەش کە دەربارەی هەیە نووسیمان، لەڕاستییدا ئەم فەرموودەیە ، فەرموودەیەکی چەسپاوە، بەچەندەها گێڕانەوە و ڕێگای جیاجیا لە زانایانی بواری فەرموودەوە گێڕدراوەتەوە، بەم شێواز و ڕێگایانەی لای

خوارەوە:

أ. پێشەوا موسلیم لە پەرتووکە صەحیحەکەیدا لە رێگای (عبدالرزاق)ەوە، ئەویش لە (معمر)ـەوە، و ئەویش لە (عبدالله بن طاوس)ـەوە، و ئەویش لە باوکیەوە و ئەویش لە (عبدالله بن عباس)ـەوە، هێناویەتی، کە فەرموویەتی: تەلاق لە سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، و پێشەوا ئەبوبەکر و دوو ساڵ لە جێنشینایەتی پێشەوا عومەردا، تەلاقی سێ بە سێ بەیەك تەلاق هەژمار دەکرا، جا پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب فەرموی: بەڕاستی خەڵکی لە کارێکی وادا کە دەبوو شێنەیی و لەسەرخۆ بن، کەچی پەلەیان کرد، ئەگەر گوێیان پێ نەدەین و بۆیان شل بکەین سەری تێدەکەن، بۆیە هەر سێ تەلاقەکەی بەسەردا چەسپاندن و لەسەری هەژمار کردن.[1]

ب . پێشەوا ئەبوداود لە سونەنەکەیدا لە رێگای ئەحمەدی کوڕی صالحەوە ئەویش لە (عبدالرزاق)ەوە ئەویش لە (ابن جریج)ـەوە، و ئەویش لە (ابن طاوس)ـەوە، و ئەویش لە باوکیەوە هێناویەتی کە (ابو صهباء) بە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسی گوت: ئایا دەزانیت کە سێ تەلاقە بەیەك تەلاق هەژمار دەکرا لە سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و پێشەوا ئەبوبەکر و پێشەوا عومەردا؟ ئیبن عەبباسیش لەوەلامدا فەرمووی: بەڵێ.[2]

ج . لە رێگای حەممادی کوڕی زەیدەوە ، ئەویش لە ئەیوب و ئەویش لە ئیبراهیمی کوڕی مەیسەر و ئەویش لە تاوسەوە، هێناویانە کە ئەبو صەهباء بە ئیبن عەباسی گوت: ئایا لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) سێ تەلاقە بە دانەیەك هەژمار نەدەکرا، و دانەدانرا؟ ئیبن عەبباسیش گوتی:

---

[1] فتح الباري شرح صحيح البخاري، ب٩، ل٣٦٢. و سنن أبي داود، لەگەڵ حاشیەی (عون المعبود)، ب٢، ل٢٢٨. نيل الأوطار، ب٦، ل٢٥٨، سبل السلام، ب٣، ل٢٢٥.

[2] سنن أبی داود لەگەڵ پەراوێزی (عون المعبود) ب٢، ل٢٢٨.

بەڵێ وابوو، بەڵام کە سەردەمی پێشەوا عومەر هاتە پێشەوە، خەڵکی لە پرسی تەڵاقدا سەریان تێکرد و تەڵاقیان بەسەریەکدا دەخست و پەلەیان تێدا دەکرد و بە جارێ لە دەمیان دەردەچوو، خراپ گۆو دەمشڕ بوون، بۆیە پێشەوا عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) لەسەری هەژمارکردن.[1]

د . پێشەوا حاکم لە (المستدرك)دا، گێڕاویەتییەوە کە (ئەبو جەوزاء) هاتە لای ئیبن عەبباس و گوتی: ئایا دەزانیت کە سێ تەڵاقە لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) دەگێڕدرانەوە بۆ یەك تەڵاق؟ گوتی: بەڵێ، پێشەوا حاکمیش دەفەرموێت: ئەم گێڕانەوەیە ڕشتە (سند)ـەکەی صەحیحە.[2]

هـ . هەر لە پێشەوا (ئەبو داود) بە گێڕانەوەیەکی تر هێناویەتی کە دەڵێت: کابرایەك کە بە (ئەبو صەهباء) ناسرابوو، پرسیاتری زۆری لە ئیبن عەبباس دەکرد، جارێکیان پرسیاری لێکرد و گوتی: ئایا نەتزانیوە کە پیاو ئەگەر بە سێ بە سێ تەڵاقی ژنەکەی بدایە، پێش ئەوەی گواستبێتیەوە ئەوا بە یەك تەڵاق بۆی دادەنرا، لە سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و پێشەوا ئەبوبەکر و سەرەتای فەرمانڕەوایەتی پێشەوا عومەردا؟! جا ئیبن عەبباس لە وەڵامدا فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر پیاو تەڵاقی ژنەکەی بدایە پێش گواستنەوە و سەرجێیی لەگەڵیدا، ئەوا بە یەك تەڵاق بۆی هەژمار دەکرا، لە سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و پێشەوا ئەبوبەکر و سەرەتای فەرمانڕەوایەتی پێشەوا عومەردا، جا کە خەڵکی بینی تەڵاق بە شوێن یەکدا دەخەن

---

[1] حاشية عون المعبود، لەسەر سونەنی ئەبوداود، ب٢، ل٢٢٨، لەگەڵ پەراوێزی إغاثة اللهفان، ب١، ل٣٠٢، هەروەها سەرچاوەی پێشوو (فتح الباري).

[2] پەرتووکی (إغاثة اللهفان) ب١، ل٣٠٣.

فەرمووی: لەسەریان هەژمار بکەن.[1]

جا ئەوانەی کە ئەم فەرموودەیە بە دەردەدار و نەخۆش دەزانن لەو شەرعزانانەی کە پێیان وایە سێ تەڵاقە بە جارێ دەکەوێت ئەم پێڕە دەستیان گرتووە بە شێواز و شێوگی (سیاق)ـی، ئەم گێڕانەوەیەی کۆتاییەوە، لەسەر بنەمای ئەوەی کە فەرموودەکە لەبەر رۆشنایی ئەم گێڕانەوەیەدا ئەو بانگەشەیە ناچەسپێنێت کە دەبێژێت تەڵاقی سێ بە سێ بە ڕەهایی چ بۆ ژنی گواستراوە و چ بۆ نەگواستراوە، هەر بە یەك تەڵاق هەژمار دەکرێت، هەروەها ئەوانەی کە لەم پرسی تەڵاقەدا جیاوازی دەکەن لە نێوان ژنی گواستراوە و نەگواستراوەدا هەر پشت بەم گێڕانەوەیە دەبەستن کە دەڵێن، هەر سێ تەڵاقەکە بۆ ژنی گواستراوە دەکەون، بەڵام ئەگەر نەگواسترابوویەوە ئەوا یەك تەڵاقی دەکەوێت، بێگومان ئێمە پێشتر توێژینەوە و تاوتوێی ئەم ڕا دەگمەنەمان کرد، کە ئەم تەڵاق کەوتنە سەبارەت بە ژنی نەگواستراوە جیا دەکاتەوە، بۆ هەریەکەیان بڕیارێك دەدات، هەروەك تاوتوێی سەرجەمی ئەو قسانەمان کرد کە سەبارەت بە فەرموودەکەی ئیبن عەبباس گوتراون، بە سەراپای گێڕانەوەکانییەوە، نامانەوێت لێرەدا دیسان پەنا ببەینەوە بەر دووبارەکردنەوەی، کە بێگومان سەر لە درێژ دادڕییەکی بێزارکەرەوە دەردەکات. بەڵام حەز دەکەم کە هەندێ لەو قسانەی کە شەرعزانانی فەرموودە لەسەری زیاد بکەم کە فەرموویانە سەبارەت بەم تێکستە لکێنراوە بە گێڕانەوەکەوە کە دەڵێت: (قبل أن یدخل بها) پێش ئەوەی کە سەرجێی لەگەڵدا کردبێت، جا عەللامە ئیبن قەیمی جەوزی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: خودی گێڕانەوەکەی گاووسی لە ئیبن عەباسەوە هیچ شتێکی سەبارەت بە حاڵەتی پێش سەرجێی کردن، تیادا نییە، (واتە بە ڕەهایی

---

[1] سنن أبي داود لەگەڵ حاشیەی (عون المعبود) چاپی دار الکتب العربي لە بەیروت، ب٢، ل٢٢٨.

هێناویەتی)، و هێنانی ئەم بڕگە لکێنراوە پێیەوە لەم گێڕانەوەیەدا لەسەر بنەمای پرسیارێکی تایبەت بووە بۆ تەڵاقی ئافرەتێکی نەگواستراوە و ئیبن عەبباسیش وەڵامی ئەو پرسیارەی بواری تەڵاقە لە پێش گواستنەوەدا دەداتەوە بۆیە ئەو بڕگە لکێنراوە (قَیدَ) هەڵگری مانای پێچەوانە (المفهوم المخالفـه) نییە.

ـ لە حاشیەی (عون المعبود) لەسەر سونەنەی پێشەوا ئەبوداوددا هاتووە کە نوسیویەتی : ئەوانەی کە ڕایان وایە کە ئافرەتی تەڵاقدراو دوای سەرجێی کردن لەگەڵیدا تەڵاقی سێ بە سێکەی دەکەوێت، ئەگەر سەرجێی لەگەڵدا نەکرابوو ئەوا یەك تەڵاقی دەکەوێت دەستیان گرتووە بەم گێڕانەوەیەوە، جا بەم شێوازە وەڵامیان دەدرێتەوە کە مەرجدارکردنی پرۆسەکە بەو ژنەی کە سەرجێی لەگەڵدا نەکراوە، دژایەتی و پێچەوانەگەری نییە، لەگەڵ ڕاستێتی گێڕانەوە صەحیحەکانی تری ئەم فەرموودەیەدا کە باس لە ژنێك دەکەن، کە دوای سەرجێیی کردن لەگەڵیدا تەڵاق دراوە و ئەوپەڕی قسەیش لەم گێڕانەوەیەدا ئەوەیە کە دان دەنێت بە بەشێك لە بڕگەکانی واتا و ماناداری (المدلول)ـی، ئەو گێڕانەوە صەحیحەدا کە لە دوای ئەم گێڕانەوەیەوە دێت، ئەمەیش هیچ پێویست ناکات کە تایبەت بێت بەو دەقەی گێڕانەوەیەوە کە دان پیادانانەکەی تیادا هاتووە.[1]

ئینجا ئەم فەرموودەیەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوای لێ ڕازی بێت) صەحیحە، و مانای ئەوە دەدات بەدەستەوە کە تەڵاقی سێ بە سێ هەرکات پێکەوە دەربڕدران تەنها یەك دانەیان دەکەوێت.

ـ زانای پایەبەرز ئیبن حەجەری عەسقەلانی لە پێشەوا قورتووبییەوە بۆمان دەگوازێتەوە کە فەرموویەتی: (أنتِ طالق ثلاثاً) سێ تەڵاقت کەوتبێت، دەستەواژەیەکی لکاوە و پچڕاو (منفصل) نییە، جا چۆن دروستە کە بکرێت

---

[1] عون المعبود على سنن أبي داود، ب٢، ل٢٢٨.

بە دوو وشە و هەر وشەیەکیان حوکمێکی تایبەتی بەسەردا بدرێت.[1]

ـ پێشەوا ئیبن قەیمی جەوزی (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت بێگومان فەرموودەی (الطلاق الثلاث واحدة) تەلاّقی سێ بە سێ بە دانەیەك دادەنرێت، سێ کەس لە ئیبن عەباسەوە گێڕاویانەتەوە : طاووس کە ئەم دیارترین کەسیانە، کە لێیەوە گێڕاویەتیەوە، هەروەها ئەبو صەهبائی عەدەوی و ئەبولجەوزاء.[2]

ـ لە پەرتووکی (سُبُلُ السَّلام)دا هاتووە کە نووسیویەتی: رووکەشی قسەکەی ئیبن عەبباس کە دەڵێت : سێ تەلاّقە بە تەلاّقێك دانراوە، بە هەر جۆرە دەربڕینێك وترابێت هەر هەڵگری ئەو مانایەیە.[3]

ـ شیخ الاسلام ئیبن تەیمیە (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: نەمانبیستووە و نەمانزانیوە کە کەسێك سێ تەلاّقەی ژنەکەی دابێت لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بەیەك وشە و دەربڕین، جا پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) پابەندی کردبێت، بە هەر سێکیانەوە، لەم بارەیشەوە هیچ گێڕانەوەیەکی دروست یان جوان (حَسَنْ) نەگێڕدراوەتەوە و خاوەنی پەرتووکە بڕواپێکراوەکانیش هیچ زانیارییەکی لەم جۆرەیان نەگواستووەتەوە بۆمان، بەڵکو لەم بارەیەوە فەرموودە گەلێکیان گێڕاوەتەوە کە سەرجەمیان لاوازن، بەپێی فەرمایشی تێکڕای زانایانی فەرموودە، تەنانەت هەڵبەستراویشن، تەنانەت ئەو فەرموودەیەی کە لە پەرتووکی صەحیحی موسلیم و سونەن و موسندەکانی تری فەرموودەشدا هاتووە، کە لە طاوس، ئەویش لە ئیبن

---

[1] فتح الباري، شرح صحيح البخاري، ب٩، ل٣٦٢.

[2] إغاثة اللهفان، ب١، ل٣٠٣.

[3] سُبُلُ السَّلام شرح بلوغ المرام من جمع أدلة الأحكام، للحافظ ابن حجر العسقلاني، شرۆڤەکردنی پێشەوا موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی صەنعانی، ب٣، ل٢٢٦.

عەبباسەوە گێڕاویەتییەوە هەر ئەوەیە کە دەڵێت: (تەڵاق لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) و پێشەوا ئەبوبەکر و دوو ساڵ لە جێنشینایەتی پێشەوای عومەردا سێ تەڵاقە یەکێك بوو)، پێشەوا عومەر فەرمووی: بێگومان خەڵکی لە کارێکدا پەلەیان کرد کە دەبوو تیایدا لە سەرخۆ و شێنەیی بن، نابێت بەریان بۆ شل بکەین، بۆیە هەر سێ تەڵاقەکەی بە سەردا چەسپاندن و هەژماری کردن لە سەریان [1].

- پێشەوا ئیبن قەیم (رەحمەتی خوای لێ بێت) کە زانایەکی مەزنە و لە ساڵی (٧٥١)ی کۆچی وەفاتی کردووە، دەفەرموێت: ئەوە قورئان و ئەوە سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەوەیش زمانی عەرەبی و ئەوەیش نەریتی گفتوگۆ و دیالۆگ، ئەوەیش جێنشینی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و سەرجەمی هاوەڵانیش لە سەردەمەیدا لەگەڵیدا هاوڕابوون و ئەوەتا سێ ساڵیش لە سەردەمی پێشەوا عومەردا کە لەسەر ئەم راڕەوەی سێ تەڵاقە بە دانەیەك هەژمار کردنە بوون، جا ئەگەر کەسێك بێت و سەرژمێری یەك بەیەکیان بکات، ئەوا بۆی دەردەکەوێت کە هەموویان سێ تەڵاقەیان بە یەك تەڵاق هەژمار کردووە، ئیتر یان بە فەتوادانیان وایان کردووە یان بە دانپیانانیان، ئەگەر گریمان کەسێکیشیان ڕای وانەبوو بێت، خۆ نکوڵیشی لەم فەتوایە نەکردووە.[2]

## سێیەم: قیاسکردن لەم پرسەدا:

کۆتا بەڵگە کە پشتیوانانی ئەم ڕایە دەستیان پێوەگرتووە، بریتیە لە (بەڵگەی قیاس، بەبەرداگرتن)

---

[1] مجموع الفتاوى لشيخ الإسلام ابن تيمية، ب٣٣، ل١٢- ١٣.

[2] پەرتووکی اعلام الموقعين عن رب العالمين، نووسراوی پێشەوا ئیبن قەیمی جەوزی، ب٣، ل٢٤.

واتە قیاسکردنی ئەم پرسە بە هەندێ لەو حوکمانەی کە جار لـە دوای جـار هاتوون، بڕیاریشیان لەسەر دراوە و ئەو بە شوێن یەکدا هاتنەیان لەبەرچـاو گیراوە، لەم بارەیەشەوە نموونەی زۆریان لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیـه وسـلم) و دەســتەواژەکانی گرێبەســتەکان (صـیغ العقــود) و دانپێدانانەکان (الإقرار) و هتد.... دا هێناوەتەوە، لەوانە:

أ. خوای پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ ﴿٦﴾ وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ ﴿٨﴾ وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِن كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ ﴿٩﴾﴾،[1] جا ئەگەر پیاو لەبەردەم قازیدا چوار جار گوتی: شایەتی دەدەم بە خودا کە بێگومـان من ڕاستگۆم و یاخود ژنەکە چوار گوتی: شایەتی دەدەم بە خودا، کە ئەو پیاوەم درۆ دەکات، ئە م شایەتیدانە یەك شایەتیدانە و بە چوار شایەت هەژمار ناکرێت، جا ئیتر چۆن بێژەی (أنتِ طالقٌ ثلاثًا) سێ تەلاّقەتـە کەوتبێت، بە سێ تەلاّق هەژمار دەکرێت؟!

ـ پێشەوا ئیبن قەیمی جەوزی دەفەرموێت: چ قیاسکردنێك لەم قیاسە ساغترە؟ هەرچی بابەتێك کە ژمارەی تێدا ڕەچاو کراوە لە پرسـی دانپێـدانان و شـتی

---

[1] (النور: ٦ـ ٩)، واتە: ئەو پیاوانەیش کە نیسبەتی زینا ئەدەن لە ژنی خۆیـان و لە خۆیان بەولاوە شایەتیان نییە بۆ ئیسپاتکردنی قسەکەیان، ئەوە ئەبێ هەرکام لەو جۆرە کەسانە چوار جار بڵێ: من خوا بەشایەت ئەگرم کـە لـەم نیسـبەتدانی زینایەدا بۆ ژنەکەم، ڕاست ئەکەم(٦) شایەتیدانی پێنجەمیشی ئەوەیە کـە بڵـێ: لەعنەتی خوام لێبێ، ئەگەر درۆ بکـەم(٧) سـزا لـە کۆڵی ژنەکـەیش ئەکاتـەوە، ئەوە کە چوار جار شایەتی بڵێ: من خوا بەشایەت ئەگرم کە ئەم پیاوە درۆ ئەکا کە نیسبەتی زیناکردن ئەدا لە من(٨) شـایەتیی پێنجەمیشـی ئەوەیـە کـە بڵـێ: غەزەبی خوام لێبێ ئەگەر ئەو پیاوە ڕاست بکاو من زینام کردبێ.

تردا هەر بەم شێوازەیە و لەبەر ئەمە ئەگەر ئەو کەسەی کە دان دەنێت بە شەرواڵ پیسی کردندا بڵێت چوار جار دان دەنێم بە کردنی کاری شەرواڵ پیسییدا، ئەوە تەنها یەك جاری لەسەر هەژمار کراوە، بۆیە هاوەڵان بە (ماعیز)[1]یان گوت ئەگەر چوار جار دان بنێی بەو کردەوەیەتدا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەردەبارانت دەکات، جا کە گوترا چوار جار دانی پیادا نا ئەوە هەر بە یەك جار هەژمار دەکرێت، جا تەڵاقیش هەر بەم شێوازەیە و وەك یەك وان.

ب . ئەگەر بڵێت (سەد جار سبحان الله) یان (سەد جار الحمد لله)، ئەوە هەریەك جاری بۆ هەژمار دەکرێت.

ـ شێخ الاسلام ئیبن تەیمیە دەفەرموێت: دەقی فەرمایشتی خوای پەروەردگار (الطلاق مرّتان) واتە جار لە دوای جار، وەك چۆن کە بە پیاوێك بگوترێت (سبّح مرّتین) دوو جار (سبحان الله)ی کرد، یان (سبّح ثلاث مرّات، أو مائة مرّة) کابرا سێ جار یان سەد جار (سبحان الله)ی کرد، کە بێگومان پێویستە کە ئەوەندە جار (سبحان الله) بکات، جا فەرمانەکەی بەجێ دێت و ژمارەکان دێنە دی، جا ئەگەر ویستی کورتی بکاتەوە و بڵێت : دوو جار (سبحان الله) یان سەد جار (سبحان الله)، ئەوە تەنها یەك دانە (سبحان الله)ی کردووە، خوای پەروەردگاریش نەیفەرموو: (الطلاق طلقتان) تەڵاق دوو تەڵاقە، بەڵکو فەرموویەتی: (مرّتان) دوو جارە، بۆیە ئەگەر کابرا بە ژنەکەی وت (أنتِ طالقٌ اثنتین، أو ثلاثاً، أو ألفاً) دوو تەڵاقت کەوتبێت، یان سێ تەڵاق، یان هەزار تەڵاق، ئەوە تەنها یەك جار تەڵاقی داوە و بەس.[2]

ـ ئینجا فەرمایشتەکەی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بۆ دایکمان خاتوو

---

[1] ماعیز، کوڕی مالیکی ئەلەمییە، لەلای پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) دانی نا بەوەدا کە زینای کردووە و پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بەردەبارانی کرد.

[2] إغاثة اللهفان، ب١، ل٣٠٧.

جوەیریـیەی کچی حارس، کە پێی فەرموو: من لە دوای تۆ چوار وشەك گوت، کە ئەگەر لەگەلّ ئەو وشانەی تۆدا کێشانە بکرێت، کە لەو کاتەوە گوتووتە ئەوا هاوسەنگ و هاوتا دەردەچن، وشەکانیش ئەمـانەن:
(سبحان الله عدد خلقه، سبحان الله زنة عرشه، سبحان الله رضى نفسه، مداد کلماته) پاکی بۆ خودا هێندەی دروستکراوەکانی خوا، پاکی و بێگـەردی بـۆ خودا هێندەی ئەندازەی سەنگینی عەرشی خودا، پاکی بۆ خوای پـەروەردگار هێندەی خۆی پێی رازیـــە و ئەوەنـدەی مەرەکـەبی وشـەکانی زاتـی خـۆی، بێگەردی بۆ ئەو زاتە.[1]
کە ئەم فەرموودەیە هەلگری ئەو مانایەیە کە خوای پەروەردگار شایانی پاك و بێگەرد ڕاگرتنە، هێندەی ئەو ژمارەیە، کەواتە ئەو ئەندازەیە جارێك دەبێتە وەصف و ئاوەلّناو بۆ کردەوەی بەندەکەی خوا و کە کردەوەکەشـی سـنووردارە، جارێکیش دەبێتە ئەو ڕێژەیەی کە خوای پەروەردگار شایەنیەتی، کە ئەمەیش بە هۆی ئەم ئەندازەیەوە کێش و سەنگییەکەی زیاد کردووە.
جا ئەگەر کابرای نوێژکەر لە نوێژەکەیدا بلێـت: (سـبحان الله عـدد خلقـه) پاکی و بێگەردی بۆ خوای پەروەردگار هێندەی ژمارەی دروستکراوەکانی خوا، ئەوە تەنها یەکجار (سبحان الله)ی کـردووە، ئەگـەر وابوایـە پێغەمبـەریش (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی دانەدەنا کە لە دوای نوێژەکان (٣٣) جار بگوترێت (سبحان الله)، (٣٣) جار بگوترێت (الحمد لله) و (٣٣) جار بگوترێـت (الله اكبر)، ئەگەر کابرا بلێت: (سـبحان الله والحمـد لله والله أكـبر عـدد خلقـه) هێندەی ژمارەی دروستکراوانی خوا (سبحان الله، والحمد لله والله أكبر) ئەمە تەنها یەك دانەی بۆ هەژمار دەکرێت.[2]
هەندێ لە زانایانی پشتیوانی ئەم ڕایە دەفەرموون کە ئەم ڕایە لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) و پێشەوا ئەبوبەکر و دوو سـالّی دەسـەلاّتی

---

[1] پێشەوا موسلیم لە پەرتووکە صەحیحەکەیدا هێناویەتی.
[2] مجموعه الفتاوى، لشيخ الاسلام ابن تيميه، ب٣٣، ل١٢ـ ١٣.

پێشەوا عومەردا ئیجماعی لەسەر کراوە، هیچ ئیجماعێکی تر بەرپا نەبووە، تا بەتاڵی بکاتەوە.

پێشەوا ئیبن قەیمی جەوزی دەفەرموێت: مەبەستەکە ئەوەیە کە ئەم فەرمایشتە (طلاق الثلاث واحدة) سێ تەڵاقە بە یەکێك هەژمار دەکرێت، قورئان و سوننەت و قیاس و ئیجماعی دێرین، بەڵگەن لەسەری. لە دوای ئەمەوە ئیجماعی تر نەهاتووە، کە ئەو ئیجماعە دێرینە هەڵبوەشێنێتەوە، بەڵام ڕای پێشەوای بڕواداران عومەری کوڕی خەتتاب (خوای لێ ڕازی بێت) کە فەرمووی: خەڵکی پرسی تەڵاقیان لا بووەتە قەشمەری و بە سوکی دەزانن، زۆر لە خەڵکی بە جارێك هەر سێ تەڵاقەکانیان دەخستن، بۆیە بۆ بەرژەوەندی وا بە چاك زانی سزایان بدات، بەوەی کە هەر سێ تەڵاقەیان لەسەر هەژمار بکات، تا فێر بن، بزانن کە هەرسێکیان بەجارێك هەر سێ تەڵاقەکەی خست، ئەوا ژنەکەی لێ دەبێتە (بائنة) بێگانە و لێی حەرام دەبێت و هەر سێ تەڵاقەکەی دەکەون و ئەو حەرامییە بەردەوام دەبێت تا ژنەکەی شوو دەکات بەپیاوێکی تر بە دڵی خۆی و مەبەستی پێی بەردەوامی بێت لەو هاوسەرگیرییە نوێیەدا و ئەگەر بەرێکەوت نەگونجان و جیابوونەوە، بیخوازێتەوە، واتە هەموو پرۆسەکە و بەهەردوو لا ئارەزوومەندانە بێت، نەك مارە بەجاش بێت.[1]

## چوارەم: پەسەندکردنی ڕای لە پێشتر (الترجيح)، لەم پرسەدا:

لەڕاستیدا من خۆم بە شیاوی ئەوە نازانم کە بتوانم ڕای لەپێشتر دیاریی بکەم و لەم پرسەدا تەرجیحی ڕایەك بەسەر ڕایەکی تردا بدەم، بانگەشەی ئەمەیشم نەکردووە، بۆیە تەرجیحکردنی من لەم بابەتەدا، تەنها دووبارەکردنەوەیەکی کورتی ئەو فەرمایشتانەیە کە زانایانی پێشینە و پاشینە لەم پرسە سامناکەدا فەرموویانە، کە پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە ژیان و بارودۆخی

---

[1] اعلام الموقعين، ب٣، ل٣٥ـ ٣٦.

ملیۆنەها خێزانی موسڵمانەوە هەیە و ئەم فەرمایشتانەش بەم شێوازەی لای خوارەوە کورت دەکەمەوە:

- خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴿٥٩﴾﴾[1] جا هەندێ لە زانایان دەفەرموون گوێڕایەڵی خودا گەورە، واتە کارکردن بە قورئانی پیرۆز و گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) واتە کارکردن بە سوننەت و گوێڕایەڵی کردنی فەرمانڕەواکان واتە کارکردن بە کۆڕا (اجماع) و گەڕانەوەیش بۆ لای خوای پەروەردگار، واتە کارکردن بە قیاس.

بەلام بە بیروڕای من، مەبەست لەم ئایەتە پیرۆزە ئەوەیە کە ژێدەر و سەرچاوەی یەکەم و کۆتایی، بۆ چارەسەرکردنی یەرجەمی گرفتە ئالۆزەکان ئیتر سروشتی ئەو گرفتانە هەر جۆرێك بن، هەر بریتییە لە خوای پەروەردگار، دەبێت بۆ چارەسەرکردنیان بگەڕێینەوە بۆ لای ئەو زاتە، نموونەی لەمەیش لە ژیانی دونیاماندا ئەوەیە کە هەر پرسێك کە دەیجوڵێنین بۆ ئەوەی چارەسەری بۆ دیاری بکەین، سەرەتا لە کارمەندێکی گچکەوە دەست پێدەکەین ئەگەر زانیمان ئەم توانای چارەسەرکردنی نییە ئەوا بەپێی ڕیزبەندی و قۆناغەکانی دەچین تا دەیگەیەنینە لای بەرزترین دەسەلات، کە

---

[1] (النساء : ٥٩ )، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هەیە بەگوێی ئەمرەکانی خوداو پەیامی پێغەمبەر بکەن ، هەروەها بەگوێی ئەوانە بکەن کە کاروباری موسوڵمانان ئەبەن بەڕێوە، جا ئەگەر ناکۆکییەك کەوتە بەینتانەوە ئەوا، پێویستە بیگەڕێننەوە بۆ لای فەرموودەی خوداو پێغەمبەرو حەواڵەی ئەوانی بکەن، تا ئەوان خیلافەکانتان چار بکەنو لەبەر ڕووناکی ئەمری ئەواندا بیبڕنەوە، چار کردنی خیلافەکانتان بەم جۆرە چاکترو جوانترە لەوەی کە نەیگێڕنەوە بۆ لای فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا.

سەرۆکە دەوڵەتە، بەمەبەستی چارەسەرکردنی.

لەم پرسی تەڵاقەیشدا، لــە ئــەنجامی ئــەو خســتنە بەرچــاوە پــان و پــۆڕەی رابردوودا، بۆمـان روون بوویەوە، کە هەر لە سەرەتای هـاتنی ئـاینی پـیرۆزی ئیسلامەوە تا ئەمڕۆ ئەم پرسە پرسێکی پـڕ لــە ڕاجیـایی و نـاکۆکی بــووە، هەروەها ئەوەیشمان بۆ دەرکەوت کە بەڵگەی هەموو ئاڕاسـتەیەك بەڵگــەی گومانـاوی (ظني)ین و بەشێوەی یەکلاکەرەوە (قطعي) مانای حوکمەکە نادەن بەدەستەوە، بۆیە ڕای هەموویان هــەڵگی پێکــان (الصــواب) و هەڵــەکردن (الخطأ)ە، واتە دەکرێت هەم پێکابێتیان و هــەم تێکــەوتبن، کەواتــە دواجــار حوکمی ئەم دۆزە، حوکمێکی پڕ لە گرفت و ڕاجیایی و ناکۆکی جۆراوجــۆرە، بێگومـان خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی: (فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ )، لە هەر شتێکدا ڕاجیاییتان تێکەوت بیگەڕێننەوە بۆ لای خوا، جا با ئەم پرسە پڕ لە ناکۆکییە بگەڕێنینەوە بۆ لای خوای گەورە، لــە قورئانــە پیرۆزەکەیدا تا ببینین و بزانین قورئان لەم بارەیەوە چی تێدایە؟

<u>خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ ).</u>

- نهێنی لە هەڵبژاردنی ئەم شێوگی دەستەواژەیەدا چییە؟
- بۆچی قورئان نەیفەرمووە: (الطلاق طلقتان) تەڵاق دوو تەڵاقە.
- ئایا قورئانی پیرۆز (عدد) ژمارەی باسکردووە؟ یان (المرّة)، ئایا جیاوازیی لە نێوان ئەم دوانەدا چییە؟
- ئایا فەرمانی خوای پەروەردگار بۆ واجب بوون دەبێت، مەگەر نیشانەیەك بەرپا بێت، کە بە پێچەوانەی ئەمــەوە بیگۆڕێــت، یــان فــەرمانی خــوا بــۆ سوننەت (الندب) دەبێت؟
- ئایا لە کاتی بوونی دەقێکی ڕووندا ئیجتیهاد کردن دروستە؟
- ئایا ئەم دەقە قورئانییە ئەوەندە ئاڵۆز و ناڕوونە، تا ئــەم کێشــەکێشــە بەردەوام و ڕاجیاییە توندەی لەسەر دروست بووە؟

بــۆ وەڵامدانــەوەی ئــەم پرســیارانە و بــۆ ڕوونکردنــەوەی بەڕاســتتردانان و

تەرجیحدانی ئەو ئاراستەیەی کە بەلای تای تەرازووی خۆبەستنەوە بە سێ جار (المرّات الثلاث) دا دەشکێتەوە، لەسەرمان پێویستە کە بگەڕێینەوە بۆ لای خوای پەروەردگار و دەقەکانی قورئانی پیرۆز، لەو روانگەیەوە کە هەموو کەسێك شارەزاییەکی ئەوتۆی لە زمانی عەرەبیدا هەبێت لە مەبەستەکانی تێدەگات، ئیتر چونیەکە موجتەهید بێت یان هەر کەسێکی سادە:

(١). قورئانی پیرۆز فەرمانی کردووە بە دابەشکردنی سێ تەلاٌقە بەسەر سێ (جار)دا، بە دەقێکی وا کە زۆر بە روونی ئەم مانایە دەدات بەدەستەوە، لەسەر ئەو مانایەی کە کۆتاییهێنان بە پەیوەندی ژن و مێردایەتی تەنها بە هێنانەدی ئەو دابەشکردنە بەسەر ئەو سێ جارەدا دەبێت، ئەمەیش ئەوەیە کە خوای پەروەردگار دە فەرموێت: (ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ ).[1]

(٢). (ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ) تەلاٌق دوو جارە، ئەم تێکستە بە شێوەی فەرمانکردن و داواکاری هاتووە، لەگەلٌ حەتمیەت و پابەندبوونی تەواو پێیەوە و بە ناوەڕۆکەکەیەوە، هەروەها بە بەرگی (الجملة الخبرية) رستەی هەوالٌی خۆی دەرخستووە، تا بە هۆی ئەم شێوگە ڕەوانبێژییەوە زیاتر هەلٌگری مانای جەختکردنەوەی زیادە و بایەخدان بێت، بەو فەرمانەی کە خوای پەروەردگار کردوویەتی، هانیشمان بدات، لەسەر تێنەپەڕاندنی سنوورەکانی خوای گەورە وەك لە دوا بڕگەی ئایەتەکەدا هێناویەتی: (تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعۡتَدُوهَاۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ).[2]

---

[1] ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَأۡخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِۖ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَا فِيمَا ٱفۡتَدَتۡ بِهِۦۗ تِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعۡتَدُوهَاۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ ﴾ (البقرة : ٢٢٩).

[2] (البقره : ٢٢٩ )

(٣). فەرمانکردن بەهەر شتێك رێگری کردنە لە پێچەوانەکەی، ئەمەش رێسا (قاعیدة)یەکی شەرعی چەسپاوە و زانایانی زانستی ئوصول و شەرعزانەکان دانیان پیایدا ناوە، بۆیە فەرمانکردن بە (المرّات) جارەکان، خۆی لە خۆیدا رێگری کردنە لە پەنابردن بۆ (الأعداد) ژمارەکان، ئیتر ژمارە (دوو) بێت، یان (سێ)، چونکە لە یاسای یەکەمیاندا واتە (المرّات) جارەکاندا بەرژەوەندی دەرفەت ئامێز (مصلحة الفرصة) هەیە، هەروەها بوارێکی تێدایە بۆ دەستپێکردنەوەی ژیانی هاوسەرایەتی، هەروەك خوای پەروەردگار ئاماژەی پێ دەکات و دەفەرموێت: (لَا تَدْرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا)،[1] بەڵام لە کۆکردنەوەی تەڵاقەکاندا بەیەکەوە و بە یەکجار خراپە و ناهەمواری تێدایە و دەبێتە هۆکاری داخستنی دەرگای مۆڵەت و درفەت بە رووی ژن و پیاودا.

(٤).خوای پەروەردگار ویستوویەتی کە پرسی تەڵاق لە (سێ جار)دا بێت، و بڕیاردان و دەربڕینی ئەوەی کە گوایە دروستە هەر سێ تەڵاقەکە بێکەوە کۆبکرێنەوە و بەیەکجار بەپێی حەز و ویستی پیاوەکە دەربڕدرێن ئەمە (پەنا بە خوا) زاڵکردنی ویستی پیاوەکەیە بەسەر ویستی خوادا، شتی لەم جۆرەیش لۆژیکی شەریعەتی ئیسلامی رەتی دەکاتەوە.

(٥). دەقی (ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ) بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە (قطعی) مانای ئەوە دەگەیەنێت کە دەبێت ئەو (مرّتان) دوو جارە، کاتێك بکەوێتە نێوانیانەوە و بۆیە راڤەکردنی ئەو دووجارە بە (دوو دانە) یان بە (دوو تەڵاق)، یاخود راڤەو شرۆڤەکردنی (المرات الثلاث) سێ جار بە (الطلقات الثلاث دفعة واحدة) هەرسێ تەڵاقەکە بە جارێك، بەبێ بوونی کات لە نێوانیاندا، لەڕاستییدا ئەمە راڤە و شرۆڤەکردنێکە کە لۆژیکی زمانی عەرەبی رەتی دەکاتەوە.

(٦). لەفز و دەربڕینی (الاثنتين) دوو دانە، یان (الثلاث) سێ دانە، بیدعەیە

---

[1] (الطلاق : ١)

و داهێنراوە، چونکە دەسکردی مرۆڤ خۆیەتی و هەر خۆی دایهێناوە و کارێکی خراپە و پێچەوانەی فەرمانی راستەوخۆ و ڕاشکاوانەی خوای پەروەردگارە و بیدعەی خراپیش بەرپەرچدراوەیە، چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (کل عمل لیس علیه أمرنا فهو ردٌ) هەر کردەوەیەك کە فەرمانی رەزای ئێمەی لەسەر نەبێت و ئەنجام بدرێت ئەوا ئەو کارە قەبوڵ نییە و دەدرێتەوە دواوە.

(٧). لە دانانی ژمارە (العَدَدْ) لە جێگای (المرة: جار)دا، لەمپەڕ و گرفتی برینی رێگای گەڕانەوە بۆ دەستپێکردنەوەی ژیانی هاوسەرێتی هەیە، لە دوای ئەوەوە کە ژن و مێردەکە پەشیمانی ڕووی تێکردوون، حەزیان بە گەڕانەوە بۆ ناو کەژاوەی هاوسەرێتی هەیە، ئیتر بە ڕێگەی گەڕانەوە ژێر نیکاح (الرجعة) بێت، یاخود بە گرێبەستێکی نوێ، ئەمەیش دژایەتی و پێچەوانەگەری تێدایە، لەگەڵ ئایەتی: (مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ ) ،کە دوای ئاسانکاری دەکات[1]

(٨). فەتوادان یاخود بڕیاردان بە خستنی سێ تەلاًقە بەجارێك، بۆ ژن و مێردەکە سەختی و ئەستەمی و بێ هیوایی تێدایە و دەبێتە مایەی رووخاندنی کۆشکی هاوسەرایەتی ژیان کە بە بەرخودانی چەندەها ساڵ لەو تەمەنە زێڕینە بنیات نراوە، وێرانکردنی لە یەك سات لە ساتەکانی ژیاندا بەڕاستی کارێکی نەشیاوو ناسرووشتییە.

---

[1] ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْۚ وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ وَلِيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٦﴾ (المائده : ٦ ).

(٩). بڕیاری لەم جۆرە پێچەوانەیە لەگەڵ ئایەتی: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ﴾،[1] هەروەها لەگەڵ فەرموودەی (يسروا ولا تعسروا)، لە کاروباردا ئاسانکاریی بکەن و سەختگیری مەکەن، جا ئەگەر گوترا کە ئەم سەختی و دژوارییە، پیاوەکە خۆی بە ویستی خۆی هێناویەتییە ڕێی خۆی، با بیچەژێ! ئەوا من دەڵێم: کابرای مێرد نەزانە و هەڵەی کردووە، خوای پەروەردگار لە تەلاقێك زیاتری لەسەر ئەستۆی لابردووە، و بەرپرسیارێتی لە سەر لاداوە، و لە تاوانی هەڵە بوراوە، هەروەك دەفەرموێت: ﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ﴾.[2]

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (رُفع عن أمتي الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه). بە هەڵە کارکردن، لەبیرچوونەوە و بەرپرسیارێتی کاری زۆرداری لەسەر ئەستۆی گەلەکەم لابراوە، کەواتە لەسەر موفتی و دادوەر پێویستە کە ئەو جۆرە کەسانە ئاگادار بکەنەوە، کە ئەم کارەیان هەڵەیە و (پەنا بە خوا) یاری و گاڵتەکردنە بە قورئانی پیرۆز، چاو لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بکەن، کە چۆن کاتێك هەواڵیان پێدا کە کابرایەك ژنەکەیی بە سێ تەلاقە تەلاقداوە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) تووڕە بوو و فەرمووی: (چ بەزمە! گاڵتەجاڕی و یاری بە قورئان دەکرێت و هێشتا من لەناوتاندام!).[3]

---

[1] ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ ۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا۟ ٱلْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٨٥﴾﴾ (البقره : ١٨٥).

[2] (الأحزاب : ٥)

[3] نيل الأوطار للإمام الشوكاني، ب٦، ل٢٢٥.

(١٠). تێکستی ئایەتی (ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ) دەقێکی نادیار و ناڕوون (مجمل) نییە، تا سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) روونی بکاتەوە، هەروەها (عام) گشتی نییە تا سوننەت (تخصيص) تایبەتی بکات، هەروەها (مطلق) رەها نییە تا (مقيد) وابەستەکراوی بکات و شتێکی پێوە ببەستێت، هەروەها بڕیارێکی بێدەنگی لێکراو نییە، تا دانی پیادا بنێت، قاوی بدات، کەواتە ئەرکی ئەو فەرمووداندەی کە لەم بوار و پرسەدا هاتوون، لەوەدا کورت هەڵهێنراوە کە جەخت بکەنەوە لەسەر ئەو حوکمانەی کە قورئانی پیرۆز هانیونی، کە ئەم حوکمەش لێرەدا دابەشکردنی تەلاّقە بەسەر (سێ جار)دا، بۆیە بۆ کەسی موفتی یان قازی دروست نییە، کە کار بکات، بۆ لادانی مانای ئایەتی (الطلاق مرّتان) لە مانا راستەقینە روون و ئاشکرا و ڕاشکاوو ڕاستەوخۆکەی خۆی.

(١١). ئایەتی (ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ) دەقێکی راشکاوانەو ئاشکراو روونە، بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە (قطعي) مانای حوکمەکەی دەدات بە دەستەوە، زانایانی مسوڵمان لە زانایانی زانستی ئوصولی فیقهـ بێت، یان لە شەرعزانەکان کۆڕاو کۆکن لەسەر ئەوەی کە (لە کاتی بوونی دەقدا، بوارێك بۆ ئیجتیهادکردن نییە)، کەواتە هەموو چەلەحانێ و لادان لە مانا و ئیجتیهادکردنێك بۆ ڕاڤە و شرۆڤەکردنی ئەم دەقە، بەپێی ئەو یاسا و ڕێسا (قاعدة)یەی سەرەوە بەرپەرچدراوەیە.

(١٢). تام و چێژبردنی هەریەکە لە ژن و پیاو لە یەکتری، پرۆژە بڕیارێکی شەرعیی چەسپاوە، بەهۆی فاکتەر و هۆکارێکی شەرعییەوە کە ئەویش بریتییە لەو گرێبەستە ساغەی هاوسەرێتی، کە بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە (قطعي) چەسپاوە و جێگیر بووە و دروست نییە، بەپێی بەڵگەیەکی گومانای (ظنيٍّ) لا بدرێت و هەڵبوەشێندرێتەوە، لەو بەڵگانەی کە هەندێ لە زانایان پشتیان پێ بەستووە لە فەرموودە ئامادەکان و لەم بارەیشەوە کۆڕا (اجماع) هەیە، کە فەرموودەی (آحاد) بەڵگەیەکی گوماناوی (ظنيٍّ)یە، لە ڕووی

جێگیربوون و چەسپانەوە و هەرچەندە دەلالەتکردنەکەیشی یەکلاکەرەوە (قطعي) بێت.

(١٣). تێکەڵ و پێکەڵ کردنی (اجماع) لە تەنها مەزهەبێکدا لەگەڵ ئیجماعی گەورەدا کارێکی دروست نییە، کە ئیجماعی گەورە و پان و پۆڕ ئەوەیە کە سەرجەمی موجتەهیدەکانی ئوممەتی پێغەمبەر موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) لەسەردەمێکدا لە سەردەمەکاندا و لە دوای کۆچی دوایی ئەو زاتە کۆك و هاوڕا بووبن لەسەر حوکمێکی شەرعی، کە ئەم ئیجماعە دواییەیان بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە (قطعي)یە و دەبێت پێوەی پابەند بین، بەلاّم بێگومان کە ئیجماعەکەی پێشوو بەم جۆرە نییە.

(١٤). تێکەڵ کردنی شەریعەتی ئیسلامی و فیقهی ئیسلامی پێکەوە کارێکی دروست نییە، ئەم دوو شتە لە یەکتری جیاوازن.

(١٥). شەریعەت بریتییە لە دەقەکانی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە ئەمر و نەمر و هەمیشەیین و لەسەر گشت کەسێکی بالّغ و ژیر پێویستە کە لە سەرجەمی ڕەهەندەکانی بیروباوەڕ و کاروکردەوە و رەفتارەوە پێوەی پابەند بێت، بەلاّم فیقهی ئیسلامی بریتییە لە ڕاڤە و بیروڕا و ئیجتیهادەکانی شەرعزانە مسوڵمانەکان و دەکرێت و دەگونجێت بۆ هەموارکردنەوە و گۆڕانکاریی کردن تیایدا و هەروەها پابەندکار (ملزم) نییە، بۆ هیچ کەسێك کە بە درێژایی ژیانی پابەند بێت، پێیەوە، وەك ئەوەی کە ڕێسای (العامي لا مذهب له) پێویستی دەکات.

(١٦). هیچ یەکێك لە پێشەوایانی مسوڵمانان نەیفەرمووە کە تەنها دیدگای من ڕاستە و پێکاومە، کەسانی تری جگە لە من لەسەر هەڵەن، جا ئەگەر پێکان و سەرجەمی ڕاستییەکان لەلای یەك پێشەوا و یان چەند پێشەوایەکی دیاریکراو بوونایە، ئەوا دژبوونەوە و سەرپێچی کردنی ئەو تەنها پێشەوایە یان ئەو چەند پێشەوا دیاریکراوانە دروست نەدەبوو، بەڵکو بۆ خودی خۆیشیان دروست نەدەبوو، کە لە دەربرینی بیروڕادا پێچەوانەی یەکتری بوونایە، لەناو خۆیاندا و ئەم چەند نموونەیەی لای خوارەوەیش ئەم مانایە

دەگەیەنن، جەختکەرەوەن لەسەری کە کەس خۆی بە ئاراستەی راستی کامڵ و تــەواو دانــەناوە، ڕای بەرامبەریشــی لەبەرچــاوگرتووە، ئەمــەیش چــەند نموونەگەلێك لەم بارەیەوە:

أ. کاتێك پرسیاریان لە پێشەوا ئەبوبەکری صدیق کرد، کە یەکەم جێنشینی پێغەمبەری خــوا (صــلی الله علیــه وســلم) ســەبارەت بــە وشــەی (کلالــة) لــە ڕاڤەکەیدا، فەرمووی: ئەو کەسەی کە بە (کلالة) میرات دەبات، ئەوەیە کــە لە میراتگرەکانیدا نە کوڕ هەیە و نە باوك، ئینجا فەرمووی: ئەمە ڕای منە، ئەگەر پێکابێتم ئەوە لە خوای مەزنەوەیە و ئەگەر هەڵەیشم کردبێت ئەوە لەبە شەیتانەوەیە.[1]

ب. عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود، کــە لــە گــەورە شــەرعزانەکانی هاوەڵانــە، کاتێك کە پرسیاری لێکرا، سەبارەت بە ژنێك کە مێردەکەی مردبێــت پــێش ئەوەی بگوزارێتەوە و بڕی مارەیی بۆ دیاریی نەکرابێت، لە وەڵامدا فەرمووی: بە گوێرەی ڕای خۆم ئیجتیهاد دەکەم ئەگەر لە ئیجتیهادکردنەکــەدا پێکــام ئەوە لە خوای مــەزنەوەیە، ئەگەر هەڵەم کرد ئەوە لە (ابن أم عبد)ەوەیە، کە نازناوی خۆیەتی، جا لە وەڵامەکەدا فەرمووی: ئەو ئافرەتە مــیرات دەبــات و مارەیی هاووێنەی ئافرەتە نزیکەکانی (مهر المثل) دەبات، بەبێ زیاد و کەم.

ج. پێشەوای مەزن (ئەبو حەنیفە) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: ئەوە ڕای منە و ئەم ڕایە باشترین ئاراستەیە کە زانیومانە و بەسەریدا زاڵ بووین، جا هەرکەس لەم ڕایە باشترمان بۆ بهێنێت وەری دەگرین.

د. هەروەها پێشەوا مالیکیش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەو داوایەی خەلیفــەی عەبباسییەکانی ڕەت کردەوە، کە پێشنیاری بۆ کــرد، پــەرتووکی (الموطأ)ی دانراوی پێشەوا مالیك بکاتە ژێدەر و چاوگەی کــارپێکردن و گــوتی: ئــەی

---

[1] پەرتووکی (الترکة والمیراث في الإسلام)، د. محمد یوسف موسی، ل٢٥٤، کەواتە جگە لە کوڕ و باوك بەوانی تر لە میراتگرەکانی مردووە کە دەکوترێت (کلالة)

.

پێشەوای بڕواداران ئەم کارە مەکە، چونکە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە شارەکاندا بڵاوبوونەتەوە، زانست و شەرعیان هەڵگرتووە و بە شوێنانددا گێڕاویانە مەبەستی ئەوەبووە کە زانیاری زیاتر هەن کە لە (الموطأ)دا نین و نابێت، لەمدا کورت هەڵبهێنرێت، هەروەها ئەم پێشەوا مالیکە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هەرکات حوکمێکی شەرعیی هەڵبهێنجایەت، بە هاوەڵانی خۆی دەفەرموو: تەماشای بکەن و پێی ڕابمێنن، ئەمە ئایینە و هەموو کەسێك قسەی هەم وەردەگیرێت و هەم بەرپەرچدەدرێتەوە، تەنها خاوەنی ئەو مەزارە پیرۆزە نەبێت، واتە: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ئاماژەی بۆ ئارامگاکەی دەکرد.

هـ . هەروەها پێشەوا شافیعییەوە گێڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی: هەر فەرموودەیەك کە بە صەحیحی هات، ئەوە مەزهەبی منە و قسەکەی من بە دیواردا بدەن!

و . پێشەوا ئەحمەد (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) نکۆڵی کردووە، لە بانگەشەی ئیجماع کردن، لە پرسێکدا کە بۆ ئیجماعکردن بشێت، بەو جۆرە بانگەشەکارانەی فەرمووە: ئەو چوزانێت کە خەڵکی تر پێچەوانەی ئەو هەڵوێستیان دەربڕیوە و دژی بوونەتەوە، بەلام بەم نەگەیشتووە؟!

سەرەڕای هەموو ئەمەیش بێگومان شەرعزانەکان هاوڕاو کۆکن لەسەر ئەوەی کە بڕیارو حوکمی قازی لە گشت پرسێکی ڕاجیایی داردا یەکلاکەرەوە و لەسەر هەردوو ئاڕاستە ناکۆکەکان پێویستە بە قسەیەکەوە پابەند بن، کە ئەو ڕایەکی لەناو ئەو بیروڕا گرفتاوییە زۆرانەدا پەسەندکرد، پابەندبوونی هەموو لایەك پێیەوە پێویستە.

**(١٧). سەرچاوەگرتنی ئیجتیهادەکەی پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب (خوای لێ ڕازی بێت):** بێگومان گەورەمان، پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب ئەو پیاوە گەورەیەی کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەربارەی دەفەرموێت: (لَو کان بعدي نبي، لکان عمر بن الخطاب) ئەگەر لە دوای من پێغەمبەر بهاتایە، ئەوا عومەری کوڕی خەتتاب ئەو پێغەمبەرە

دەبوو، ئەم پیاوە ئەو مرۆڤە کاربەجێیەیە، کە دوژمنانی شایەتی زانایی و دانایی و سیاسەتوانی و کارامەیی بۆ دەدەن، سەرەڕای پێگە ئاینییەکەی، پاشان هەروەك زۆر بە ڕوونی لە فەرمووده‌کەی ئیبن عەبباسەوە دەردەکەوێت و لە فەرمایشتی ئەو شەرعزانانەی کە شرۆڤەی ئەم پرسەیان بە قووڵیی و بە بێ دەمارگیریی کوێرانە کردووە، ئەوە روون دەبێتەوە کە پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب کە بینی خەڵکی سەریان تێکردووە و تەڵاقی سێ بە سێ بە جارێك دەخەن، ڕێگری لێکردن لەم کارە و تەمبێی کردن و جا کە بینی سزای تەمبێ کردن سوودی نییە، بۆیە هەر سێ تەڵاقەکەی بەیەکەوە خستن و پابەندی کردن پێیەوە و پێی فەرموون: هەرکەس ژنەکەی لەسەر پێچەوانەی ڕەوتی شەرعی خوا لە تەڵاقدا کە جار لە دوای جارە (مرَّة بعد مرَّة) تەڵاق بدات، هەر سێ تەڵاقەکە بەیەکەوە کۆبکاتەوە، ئەوە سزاکەی بریتییە لە نەگەڕاندنەوەی ژنەکەی بۆ ژێر نیکاحی ئەم پیاوە، تا ئەبێت شوو بە پیاوێکی تر بکات.[1]

---

[1] شیخ الاسلام ئیبن تەیمیە دەفەرموێت: کە خەڵکی ئیتر پابەندییان نەمابوو، بە سێ جارەوە و لەم بوارەدا کاری حەرامیان ئەنجام دەدات، بۆیە پێشەوا عومەر وای بە باش زانی، کە پابەندییان بکات پێیەوە، چونکە ئەو خەڵکە پابەندنەبوون بە گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ مانەوەی گرێبەستی نیکاحەکەیشدا، بەڵام زۆری هاوەڵان و شوێنکەوتووان دژی هەرکەس دەوەستانەوە کە ئەمەی بگوتایەت، ئەمەیش یان لەبەرئەوەبوو، کە ئەو تەمبێ کردنەی لەو جۆرەیان پێ چاك نەبوو، یان لەبەرئەوە بوو، کە خودی شەرع تۆڵەی لەم جۆرەی دانەنابوو، ئەمە سەبارەت بە کەسێکە کە هەقی خۆیەتی تەمبێ بکرێت و تۆڵەی لێ بسەنرێت، بەڵام ئەوەی کە شایەنی تۆڵەی لێ سەندنەوە و تەمبێ کردن نییە، بە هۆی نەزانین (جهل) بێت، یاخود بە هۆی لێکدانەوەی دوورمانا (تأويل) بێت، ئەمانەیان پابەندکردنیان بە خستنی هەر سێ تەڵاقەکەیانەوە و کارێکی گونجاو نییە و بواری تیادا نییە. مجموعة الفتاوى لشيخ الاسلام، ابن تيمية، ب١٦، ل٢٣.

پاشان پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب زانایەکی شارەزا بوو بە فیقهی ئیسلامی و موجتەهیدێکی چاونەترس بوو، لە ئیجتیهادکردنەکانیدا، کە لە ژمارە نایەن، ڕەچاوی بەرژەوەندی گشتی دەکرد وەك لە بنیاتنانی دیوانەکان و دانانی زیندان بۆ تاوانبارندا کردی، هەروەها لە وەستاندنی زەکاتدان بە تازە مسوڵمان بووان، کاتێك کە بینی هۆکاری حوکمەکە گۆڕاوە، هەروەها سزای ئارەق خۆری، لە چل شەلاقەوە کرد بە هەشتا شەلاق!

بەم پێیە، کارەکەی پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب سەر بە ڕەوگەی سیاسەتی شەرعیی دێتە ئەژمار و تەماشا دەکرێت و بە چوار دەوری بەرژەوەندی گشتییدا بە بوون و بە نەبوون دەخولێتەوە وکارەکەی ئەم پرۆسەی شەرعدانان نییە، تا (بەردەوام بوون) بخوازێت، چونکە ئەم صیفەتی بەردەوامی خواستنە و هەمیشەیی بوونە، تایبەتە بە قورئانی پیرۆز و سوننەتەکانی پێغەمبەری دڵسۆز (صلى الله عليه وسلم)، جا پێشەواکانی مەزهەب (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) کەوتوونەتە ژێر کاریگەری ئەم ئیجتیهادەی پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب، بەپێی ئەم ئیجتیهادەی ئەم، فەتوایان داوە و ئەگەر خوای پەروەردگار بینوسیاسە بۆ قەدەری پێشەوا عومەر کە جارێکی تر بگەڕێتەوە سەر دنیا، ئەم بێسەروبەری و ماڵوێرانییەی ببینایە، کە مسوڵمانان، لەسەرین، لە پرسی تەڵاقدا و تەڵاقی سێ بە سێ بە جارێك دەخەن، پاساوی ئەوەی کە کارێکی شەرعییە و قورئان و سوننەت حەڵاڵی کردووە بۆیان، ئەوا لە ئیجتیهادەکەی پاشگەز دەبوویەوە و ئیتر بڕیاری لەسەر ئەو شێوازە دەدایەوە، کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) و جێنشینایەتی پێشەوا ئەبوبەکر و دوو ساڵی سەرەتای جێنشینایەتی خۆیدا کاری پێ دەکرد.

ربِّ زدني علماً وألحقني بالصالحين